# کێن ئەوانەی مەلائیکەتەکان بۆیان دەپاڕێنەوە ؟
# وە
# کێن ئەوانەی مەلائیکەتەکان نەفرەتیان لێ دەکەن ؟





نوسینی
د.فضل إلهي

وەرگێڕانی بە دەستکاریەوە
م. ابوبكر احمد



چاپی دووەم

١٤٣٣ک - ٢٠١٢ز

# کێن ئەوانەی مەلائیکەتەکان بۆیان دەپاڕێنەوە؟
# وە
# کێن ئەوانەی مەلائیکەتەکان نەفرەتیان لیَ دەکەن؟


نوسینی

**د. فضل إلهي**

وەرگێڕانی بە دەستکاریەوە

**م. ابوبکر احمد**



چاپی دووەم

١٤٣٣ ك - ٢٠١٢ ز



له بلاوکراوەکانی
کتێبخانەی سیما
٠٧٧٠١٢٣٦٠٨٩

ناوی پەرتووک

# کێن ئەوانەی مەلائیکەتەکان بۆیان دەپاڕێنەوە
# وە
# کێن ئەوانەی مەلائیکەتەکان نەفرەتیان لێ دەکەن

نوسینی

د. فضل إلهي

وەرگێڕانی بە دەستکاریەوە

م. ابوبكر احمد

چاپی دووەم: ١٤٣٣ك - ٢٠١٢ز
ژمارەی سپاردن: (١٣٤٠)




## بنکەی بلاوکردنەوە

| | | |
|---|---|---|
| کتێبخانەی سوننە سلێمانی | کتێبخانەی ئیمان سلێمانی | کتێبخانەی الاثر سلێمانی |
| کتێبخانەی بەهەشت سلێمانی | کتێبخانەی پێشین هەولێر | کتێبخانەی سیما چەمچەماڵ |
| کتێبخانەی زانست کەلار | کتێبخانەی صوهەیب کۆیە | کتێبخانەی دێرین |

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

**پێشەکی وەرگێڕ:**

إِنَّ الْحَمْدَ لِلَّهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا وَسَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِهِ اللَّهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ وَأَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٠٢﴾﴾

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴿١﴾﴾

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ﴿٧٠﴾﴾

أَمَّا بَعْدُ:

فَإِنَّ أَصْدَقَ الْحَدِيثِ كِتَابُ اللَّهِ، وَأَحْسَنَ الْهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ(ﷺ)، وَشَرَّ الأُمُورِ مُحْدَثَاتُهَا، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ، وَكُلَّ ضَلاَلَةٍ فِي النَّارِ.

خوای پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا، وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە فەرموودە صەحیحەکانیدا هەواڵیان پێداوین کە مەلائیکەتەکان هەمیشە سەرگەرمی عیبادەتو گوێڕایەڵیو بەندایەتی پەروەردگارن، بەوەی کە سوپاسو ستایشی دەکەنو زیکرو یادی دەکەن.

پـــەروەردگار دەفـــەرمووێت: ﴿ يُسَبِّحُونَ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ لَا يَفْتُرُونَ ۝٢٠ ﴾ (الأنبياء: ٢٠).

واتە: شەوو ڕۆژ تەسبیحات دەکەن‌و پەروەردگار بە پاك ڕادەگرن و ناوەســتن و مانـدو نـابن و بێـزار نـابن، هـەروەها لـە پـەروەردگاریان دەترسن و لە فەرمانی دەرناچن، پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿ يَخَافُونَ رَبَّهُم مِّن فَوْقِهِمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ۝٥٠ ﴾ ( النحل: ٥٠).

واتە: لە پەروەردگاریان دەترسـن کـە لـە سـەروویانەوەیە، وە هـەر فەرمانێکیان پێ بسپێردرێت ئەنجامی دەدەن، ئەمەش جگـە لـەوەی کە زۆربەی کارەکان بەوان سپێردراوەو ئەوان سەر پەرشتی دەکەن.

موسـڵمانی بـەڕێز: ئـەم نامیلکەیـەی بەردەسـتت، بـاس لـە دوو جـۆر خەڵکی دەکات، جۆری یەکـەمیان بەختـەوەرو سـەرفرازن لـە دونیـاو دواڕۆژدا، جۆری دوەمیان بەدبەخت‌و چارە خراپەکارن.

**دەی با بزانین کێن ئەوانەی مەلائیکەتەکان دوعایـان بـۆ دەکـەن‌و بۆیان دەپارێنەوە؟ وە کێن ئەوانەی کە مەلائیکەتەکان نەفەرەتیان لـێ دەکەن‌و دوعایان لێ دەکەن؟**

بەدڵنیایی مەلائیکەتەکان لە لای خوای گەورە زۆر بـەڕێزو گـەورەو پایە بـەرزن، پـەروەردگار دەفـەرمووێت: ﴿ كِرَامًا كَاتِبِينَ ۝١١ ﴾ (الإنفطار: ١١) واتە: فریشتەکان بەڕێزو نووسەرن.

**باوەڕداری خۆشەویست:** کەواتە ئەگەر ئەو مەلائیکەتانە ئەوەندە بەڕێز بن لای پەروەردگار، وە بەردەوام گوێڕایەڵی پەروەردگاریان بکەن‌و بەندایەتی تەنها بۆ پەروەردگاریان بکەن، ئەوا بێ هیچ گومان‌و دوو دڵییەك دوعاو پاڕانەوەیان قەبوڵە لای پەروەردگار، وە پەروەردگار ڕێی پێداون کە بۆ باوەڕداران بپاڕێنەوە، هەروەك خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَيَسْتَغْفِرُونَ لِمَن فِى ٱلْأَرْضِ ۗ أَلَآ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥﴾﴾ [الشورى: ٥].

واتە: مەلائیکەتەکان بەپاکی زیکرو یادی پەروەردگاریان دەکەن‌و داوای لێ خۆش بوونیش دەکەن بۆ ئەوانەی سەر زەوی کە باوەڕدارانن، وە ئاگاداربن کە تەنها خوای پەروەردگار لێخۆش بوو میهرەبانە.

**بۆیە...** ئەگەر پێت خۆشەو حەز دەکەیت کە مەلائیکەتەکان بۆت بپاڕێنەوەو دوعای خێرت بۆ بکەن، ئەوە هەوڵ بدە کە ئەو خاڵانەی لەم نامیلکەیەی بەردەستتدا باسکراوە جێ بە جێیان بکە، هەروەها ئەگەر دەتەوێت مەلائیکەتەکان نەفرەتت لێ نەکەن‌و دوعای شەڕت لێ نەکەن، ئەوە خۆت بپارێزە لەو خاڵانەی کەلەم نامیلکەیەدا باسکراوە.

م. ابوبكر احمد

٧/ربيع الثاني/١٤٣١

**پێشەکی نوسەر :**

إِنَّ الْحَمْدَ لِلَّهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا وَسَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِهِ اللَّهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، صَلَّى اللهُ عَليهِ وَعَلى آلِهِ وأَصحابِهِ وَبَارِكَ وسَلَّم . أمابعد:

بێگومان مرۆڤ ویستو خواستو ئارەزوی زۆری هەیەو ناتوانێت زۆریان بەدەست بهێنێت، وە هەروەها ئەو ویستو ئارەزوانەی گەمارۆ دراوە بە کێشەو بەڵاو دەردەسەری، وەناش توانێت خۆی ڕزگار بکات لێیان، بۆیە پەنا دەباتە بەر زۆرێك لە ڕێگاو هۆکارە جۆراو جۆرەکان بۆ بە دەستهێنانی ویستو ئارەزوەکانیو سەرکەوتنو ڕزگار بوون لێی، وە یەکێك لەوانەی کە مرۆڤ پەنای بۆ دەبات، بریتیە لە داواکردنی پاڕانەوەو دوعاکردن لەو کەسانەی کە گومانی خێری پێ دەبات، بە تایبەت بۆ ئەوانەی کە لە لای خوای پەروەردگار دوعاو پاڕانەوایەن قەبووڵەو گیرایە، وە بە دڵنیایی زۆرترین وەڵامدراوەی دوعاو پاڕانەوەی دروستکراوەکانی خوای پەروەردگار بریتیە لە دوعاو پاڕانەوەی مەلائیکەتەکان، چونکە ووتەیەك ناڵێن کە ڕەزامەندی پەروەردگاریانی لەسەر نەبێت، وە هیچ کارێك ناکەن ئەگەر فەرمانی پەروەردگاریانی لەسەر نەبێت، وە بۆ هیچ کەسێکیش ناپاڕێنەوە جگە لەوانەی کە پەروەردگاریان لێی ڕازیە .

پــەروەردگار دەفــەرموێت: ﴿ وَقَالُوا اتَّخَذَ الرَّحْمَنُ وَلَدًا سُبْحَانَهُ بَلْ عِبَادٌ مُكْرَمُونَ (٢٦) لَا يَسْبِقُونَهُ بِالْقَوْلِ وَهُمْ بِأَمْرِهِ يَعْمَلُونَ (٢٧) يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ارْتَضَى وَهُمْ مِنْ خَشْيَتِهِ مُشْفِقُونَ (٢٨) ﴾ [الأنبياء:٢٦-٢٨]

واتــە: خوانەناسـان دەیـان ووت: خـوای میهرەبـان کـوڕی بـۆ خـۆی بڕیارداوە، پاکیو بێگەردی بۆ ئەو زاتەیە، بەڵکو مەلائیکەتـەکان بەنـدەی ڕێزداری ئەون، ئەو مەلائیکەتانە ئەوەندە بەڕێزو ڕەوشت بـەرزن، هـەرگیز نافەرمانی نەکەنو قسە لەقسەی ئەودا ناکەنو لە گوفتاردا پێشی ناکەون، وە ئەوان بە فەرمانی ئەو دەجوڵێنەوەو فەرمانی ئەو جێ بـەجێ دەکـەن، وە هـیچ کردەوەیـەکیان نـەکردووەو هـیچ ووتەیـەکیان نـەووتووە بـەبێ زانیاری خوای گەورە، وە مەلائیکەتەکان تکاو شـەفاعەت ناکـەن بـۆ هـیچ کەسێك جگە لەوانەی کە پـەروەردگار پێـی ڕازییـە تکایـان بـۆ بکرێـت لـە ئەهلی (لا إِلَه إِلا اللَّه)و یەك خوا پەرستان، وە ئەو مەلائیکەتانە لە ترسـی ئەو زاتە ناوێرن هیچ سەر پێچیەك بکەن .

**لەم ئایەتانە خوای پەروەردگار باسی مەلائیکەی کردووە ئەوانیش:**

(أ) ﴿ لَا يَسْبِقُونَهُ بِالْقَوْلِ ﴾ زانای پایە بەرز ئیمامی (الشَّوكاني) (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لە تەفسیرەکەیدا ووتوویەتی: هیچ شتێك ناڵێن تاکو خوای پەروەردگار فەرمانیان پێدەکات، وە (إبْنُ قُتَيبة) و جگە لەویش وایان ووتووە[1].

(ب) ﴿وَهُم بِأَمْرِهِۦ يَعْمَلُونَ ﴾ زانای پایەبەرز (إبنُ حَيَّان) (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لە تەفسیرەکەیدا فەرموویەتی: هەروەك چۆن ووتەکانیان لە دوای ووتەی پەروەردگارە، بەهەمان شێوەش کارەکانیشیان بنیاتنراوە لە سەر فەرمانی خوای پەروەردگار، هیچ کارێك ئەنجام نادەن ئەگەر فەرمانیان پێنەکرابێت، ئەمەش دەستەواژەیەکە نقوم بوونە لە بەندایەتیو گوێڕایەڵیو جێ بەجێکردنی فەرمانەکانی خوای پەروەردگار[2].

**لێرەدا سودێك:** زانای پایەبەرز (إبنُ عَاشور) (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێت: پێش خستنی ﴿بِأَمْرِهِۦ ﴾ لە ﴿يَعْمَلُونَ ﴾ لەم ئایەتەی پەروەردگاردا بۆ گەڕاندنەوەیە، واتە: هیچ کارێك ئەنجام نادەن جگە

---

(١) بڕوانە: فتح القدير (٣/٥٧٩) وتفسير البغوي (٣/٢٤٢) وتفسير القرطبي(١١/٢٨١) .

(٢) بڕوانە: البحر المحيط (٦/٢٨٥) وتفسير البغوي (٣/٢٤٢) وتفسير القرطبي (١١/٢٨٢) .

لەوەی کە پەروەردگاریان فەرمانیان پێ دەکات، وەك چۆن هیچ شتێك نالێن جگە لەوەی کە ڕەزامەندی پەروەردگاریان لەسەر نەبێت، بەو شێوەیەش هیچ کارێك ئەنجام نادەن جگە لەوەی کە ڕەزامەندی خوای پەروەردگاری لەسەر نەبێت [٣].

(ج) ﴿وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرْتَضَىٰ﴾ پێشەوا (مُجَاهِد) فەرموویەتی: هەموو ئەو کەسانەن کە خوای پەروەردگار لێیان ڕازییە، وە مەلائیکەتەکان لە دواڕۆژدا شەفاعەتیان بۆ دەکەن، وە لە صەحیحی ئیمامی (مُسْلِم) وجگە لەویشدا هاتووە، هەروەها لە دونیاشدا دوعا بۆ باوەڕداران دەکەن و بۆیان دەپاڕێنەوە [٤].

وە بەڵگەی تر لەسەر فەزڵ و گەورەیی دوعاو پاڕانەوەی مەلائیکە بۆ بەندەکان، لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لای هاوەڵی بەڕێزی (سَعْدِ کوڕی عُبَادة) نانی دەخوارد، بۆی پاڕایەوە لە پەروەردگار کە سێ شتیان بۆ ببێت، لەوانە: دوعاو پاڕانەوەی مەلائیکەت.

هاوەڵی بەڕێز أَنَس کوڕی مالك (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: جارێکیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) چوو بۆلای (سَعدِ کوڕی عُبَادة)،

---

[٣] بروانه: التحرير والتنوير (٥٢/١٧) .

[٤] بروانه: تفسير القرطبي (٢٨١/١١) والبحر المحيط (٢٨٥/٦) وروح المعاني (٣٣/١٧) .

ئەویش خواردنی بۆ هێنا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) خواردی‌و پاشان فەرمووی: (أَفْطَرَ عِنْدَكُمُ الصَّائِمُونَ وَأَكَلَ طَعَامَكُمُ الأَبْرَارُ وَصَلَّتْ عَلَيْكُمُ الْمَلائِكَةُ)) [٥].

واتە: ڕۆژووانان لاتان بەربانگ بکەنەوەو پیاو چاکان خواردنتان بخۆن و مەلائیکەتەکان بۆتان بپاڕێنەوەو دوعای خێرتان بۆ بکەن [٦].

جا ئەگەر ئیش و کاری مەلائیکەت بەو شێوەیە بێت، کێ هەیە کە ژیرو هۆشمەند بێت و حەز نەکات لەو کەسانە بێت کە مەلائیکەت دوعای بۆ بکات و بۆی بپاڕێتەوە، وە کێ هەیە کە ژیرو هۆشمەند بێت و هەوڵ نەدات خۆی دوور بخاتەوە لەوانەی کە مەلائیکەت نەفرینی لێ دەکات‌و دوعای لێ نەکات.

لە قورئانی پیرۆز و سوننەتدا باسی کەسانێکی کامەران و بەختەوەر کراوە کە مەلائیکەت دوعایان بۆ دەکەن‌و بۆیان دەپاڕێنەوە، وە کەسانێکیش هەن بەد بەخت و چارە ڕەشن مەلائیکەت نەفرەتیان لێ دەکەن و دوعایان لێ دەکەن، جا بۆ زانین و ناسینی ئەو دوو کۆمەڵە، پێم خۆش بوو کە بیری برا موسڵمانەکانمی بخەمەوە بە پشتیوانی خوای پەروەردگار کە ئەم

---

[٥] (وَصَلَّتْ عَلَيْكُمُ الْمَلائِكَةُ) واتە: مەلائیکەتەکان بۆتان بپاڕێنەوەو دوعاتان بۆ بکەن .

[٦] رواه أبوداود (٣٨٤٨) وصححه الشيخ الألباني في صحيح سنن أبي داود (٢/٧٣٠) .

بابەتەم ئامادەکردووە، داواکارم لە خوای گەورەو میهرەبان هەموو لایەکمان بگێڕێت لەو کەسانەی کە مەلائیکەتەکان دوعایان بۆ دەکەن‌و بۆیان دەپاڕێنەوە، وە دوریشمان بخاتەوە لەو کەسانەی کە مەلائیکەتەکان نەفەرەتیان لێ دەکەن و دوعایان لێ دەکەن، بەڕاستی خوای گەورە بیسەری دوعاو پاڕانەوەیە.

**ڕوونکردنەوەی هەندێك لە ووشەکان:**

پێم باشە پێش دەست پێکردن ڕوونی بکەمەوە کە مەبەست لە (صَلاَة)ی خوای پەروەردگار لەسەر بەندەکانی چییە؟

هەروەها (صَلاَة)ی مەلائیکە چییە؟ وە مەبەست لە (لَعَن)ی خوای پەروەردگارو (لَعَن)ی مەلائیکە چییە؟.

**دەربارەی (صَلاَة)ی خوای پەروەردگار لەسەر بەندەکانی، زانایان باسیان کردووە بە چەند واتایەك لەوانە:**

**یەکەم:** ئیمامی (أَبُو الْعَالِيَة) ووتویەتی: (صَلاَة)ی خوای پەروەردگار لەسەر بەندەکانی، مەدح‌و پیاهەڵدانی خوای پەروەردگارە بۆ بەندەکانی لای مەلائیکەت [٧].

[٧] صَحیح البُخاري، کتاب التفسیر باب ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّ ﴾ الأحزاب:٥٦

**دووەم:** ئیمامی (الرَّاغِب اَلأَصْفَهَانِيّ) ووتویەتی: (صَلاَة)ی خوای پەروەردگار لەسەر بەندەکانی، پاککردنەوەی بەندەکانییەتی [٨].

**سێیەم:** ئیمامی (أَبُو عُبَيْد) ووتویەتی: لێبوردن و بەخشندەیی خوای پەروەردگارە بۆ بەندەکانی [٩].

**چوارەم:** (صَلاَة)ی خوای پەروەردگار لەسەر بەندەکانی، رێزو قەدرو رووسوریە .

**پێنجەم:** (صَلاَة)ی خوای پەروەردگار لەسەر بەندەکانی، بەرەکەتو فەرداریە .

**پێشەوا** (إبْنُ الجَوزي) ووتویەتی: (صَلاَة)ی خوای پەروەردگار بۆ سەرمان پێنج ووتەو بیرو بۆچوونی لەسەرە، باسی سیانیان دەکات کە (**یەکەم و دووەم و سێیەمە**) پاشان ووتویەتی: **چوارەمیان:** قەدرو رێزو رووسوریە، **وە پێنجەمیان:** بەرەکەتو فەرداریە [١٠].

**بەڵام مەبەست لە (صَلاَة)ی مەلائیکە بۆ بەندەکان چییە؟**

**پێشەوا** (إِبْنُ الْجَوْزِيِّ) ووتویەتی: لەسەر (صَلاَة)ی مەلائیکەت بۆ بەندەکان، دوو بۆچوون هەیە .

---

(٨) بڕوانە: المفردات في غريب القرآن مادة (الصلاة) صـ٢٨٥ .

(٩) بڕوانە: غريب الحديث (١/١٨٠) وشرح الطيبي (فإن الصلاة من الله رحمة) (٢/١٦٧) .

(١٠) بڕوانە: زاد الميسر (٦/٣٩٨) .

**یەکەمیان:** ئیمامی (أَبُو الْعَالِيَة) ووتویەتی: (صَلاَة)ی مەلائیکەت بۆ بەندەکان، دوعاو پاڕانەوەیە [١١].

**دووەم:** پێشەوا (مُقاتِل) ووتویەتی: (صَلاَة)ی مەلائیکەت بۆ بەندەکان، داوای لێخۆش بوون کردنە .

ئیمامی (الرَّاغِب اَلأَصفَهاني) ئەم دوو بۆچوونەی تێکەڵکردووەو فەرموویەتی: (صَلاَة)ی مەلائیکەت بۆ بەندەکان، دوعاو پاڕانەو داوای لێخۆش بوون کردنە [١٢].

**بەڵام مەبەست لە (لَعن)ی خوای پەروەردگارو (لَعن)ی مەلائیکەت:**

ئیمامی (الرَّاغِب اَلأَصْفَهَانِيّ) ووتویەتی: (اللَّعْن) واتە: دەرکردن‌و دورخستنەوە لەسەر شێوازی توڕەبوون، وە لە دواڕۆژیشدا سزادان، وە لە دونیاشدا بێ بەش بوون لە ڕەحم‌و بەزەیی خوای گەورە، وە لە خەڵکیشەوە دوعا کردنە [١٣].

ئیمامی (إبْنُ الأثير) ووتویەتی: لە بنچینەدا (اللَّعْن) دەرچوون ودورکەوتنەوەیە لە خودا، وە لە خەڵکیشەوە جوێن‌و دوعا کردنە [١٤].

---

(١١) صحيح البُخاري، كتاب التفسير باب ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِىِّ ﴾ الأحزاب:٥٦

(١٢) بروانە: المفردات في غريب القرآن مادة (الصلاة) ص ٢٨٥ .

(١٣) بروانە: المفردات في غريب القرآن مادة (لعن) ص ٤٥١ .

(١٤) بروانە: النهاية في غريب الحديث (٤/٢٥٥) وتحفة الأريب (٢٧٧) وتفسير القرطبي (٢/٢٥) .

## باسی یەکەم:
## کێن ئەوانەی مەلائیکەت دوعای خێریان بۆ دەکەن

**خــوای پــەروەردگارو پێغەمبەرەکــەی (ﷺ) باســی کەســانێکیان بــۆ کــردووین کـــە ســـەرفرازو بەختـــەوەرن و مەلائیکەتـــەکان دوعـــای خێریـــان یـــان بـــۆ دەکـــەن و بۆیـــان دەپارێنـــەوە، ئـــەوانیش ئـــەم کەسانەن:**

(١) هەرکەسێك بە دەست نوێژەوە بخەوێت.

(٢) هەرکەسێك دابنیشێت و چاوەڕوانی کاتی نوێژ بکات.

(٣) هەرکەسێك لە ڕیزی پێشەوەی نوێژی جەماعەت بێت.

(٤) هەرکەسێك لە نوێژی جەماعەتدا لە لای ڕاستی ئیمامەوە بێت.

(٥) هەرکەسێك ڕیزی نوێژی جەماعەت بەیەکتری بگەیەنێت.

(٦) موسڵمانێك کاتێك دەڵێت (**آمین**) لە نوێژی جەماعەت.

(٧) دانیشتن لە دوای نوێژی جەماعەت.

(٨) ئەنجامدانی نوێژی بەیانی و عەسر بە جەماعەت.

(٩) صەڵاواتدان لەسەر پێغەمبەری خوا (ﷺ).

(١٠) هەرکەسێك بۆ برایەکی موسڵمانی بپاڕێتەوە لە پاشملە.

(١١) هەرکەسێك ماڵ و سامان ببەخشێت لە پێناوی خوادا.

(١٢) هەرکەسێك بەڕۆژوو بێت و پارشێو بکات.

(١٣) پاڕانەوەی میوانێکی بەڕۆژوو بۆ خاوەن ماڵ.

(١٤) هەرکەسێك سەردانی نەخۆش بکات.

(١٥) هەرکەسێك قسەی خێر بکات لەسەر نەخۆش یان لەسەر مردوو.

(١٦) هەرکەسێك خەڵك فێری کاری خێرو باش بکات.

(١٧) هەرکەسێك تەوبە بکاتو بگەڕێتەوە بۆلای خوا .

(١٨) دوعاو پاڕانەوەی مەلائیکەتەکان بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ).

**بە پشتیوانی خوای پەروەردگار باسی هەموو ئەمانە دەکەین بە بەڵگەوە .**

## یەکەم: هەرکەسێك بە دەست نوێژەوە بخەوێت

یەکێك لەو سەرفرازو بەختەوەرانەی کە مەلائیکەتەکان بۆی دەپاڕێنەوە، ئەوانەن کە بە دەست نوێژەوە دەخەون.

ئیمامی (الطَّبَراني) گێڕاویەتیەوە لە إبْنُ عَبَّاس (خوایان لێ ڕازی بێت) کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (طَهِّرُوا هَذِهِ الأَجْسَادَ طَهَّرَكُمُ اللَّهُ، فَإِنَّهُ لَيْسَ عَبْدٌ يَبِيتُ طَاهِرًا إِلا بَاتَ مَلَكٌ فِي شِعَارِهِ[*] لا يَنْقَلِبُ سَاعَةً مِنَ اللَّيْلِ إِلا قَالَ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِعَبْدِكَ فَإِنَّهُ بَاتَ طَاهِرًا) [15].

واتە: لاشەتان پاك ڕابگرن[*] (واتە: دەست نوێژ بگرن) تا خوای گەورە پاکتان بکاتەوە، چونکە بەڕاستی هیچ بەندەیەك نییە بە کە دەست نوێژەوە دەخەوێت، ئیللا مەلائیکەتێکی لەگەڵدایە هیچ کاتێك لەشەو تێناپەڕێت، ئیللا ئەو مەلائیکەتە دەڵێ: خوایە لەم بەندەیە

---

[*] (شِعَارِهِ) بریتیە لەو پۆشاکەی دەلکێت بە لەشەوە، بڕوانە: الترغیب والترهیب(١/٤٠٨) .

[15] رواه الطبراني وحسنه الشيخ الالباني في صحيح الترغيب والترهيب(٥٩٩) وفي صحيح الجامع(٣٩٣٦).

[*] خۆ پاك ڕاگرتن لە کاتی خەوتندا دوو جۆرە: یەکەم: پاك ڕاگرتنی لاشە کە ئەویش دەست نوێژ گرتنە، وە خۆ پاککردنەوەی دووەم: پاککردنەوەی ناوەوەیە (غل و حەسوودی) کە ئەویش تەوبە کردنە، ئەمەیان زۆر گرنگترە لە پاك ڕاگرتنی لاشە و دەست نوێژ گرتن، چونکە پێدەچێت کەسێك لە خەودا بمرێت و پیسی و خراپەی تاوانی بەسەرەوە بێت، بۆیە پێویستە تەوبە بکات و خۆی پاك بکاتەوە لە تاوان، وە هەموو ڕق و کینەو حەسوودیەك لە دڵی دەربکات بەرامبەر موسڵمانان. بڕوانە: فیض القدیر شرح الجامع الصغیر، للإمام المناوي (٤/٢٧١ حدیث رقم: ٥٢٧٨).

خۆشبە، چونکە بە دەست نوێژەوە خەوتووە.

ئیمامی (إبنُ حِبّان) گێڕاویەتیەوە لە (ابْنُ عُمَر)ـەوە (خوایان لێ ڕازی بێت) کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((مَنْ بَاتَ طَاهِرًا بَاتَ فِي شِعَاره مَلَك لا يَسْتَيْقِظ سَاعَةَ مِنْ اللَّيْلِ إلاَّ قَالَ الْمَلَك: اللَّهُمَّ اِغْفِرْ لِعَبْدِك فُلان فَإِنَّهُ بَاتَ طَاهِراً)) [١٦].

واتە: هەر موسڵمانێك بە دەست نوێژەوە بخەوێت و ڕۆژ بکاتەوە، ئەوە مەلائیکەتێکی لەگەڵ دایەو هیچ سەعاتێك نییە کە ئەم دیوەو ئەو دیو بکاتو هەڵ بستێت، ئیللا ئەو مەلائیکەتە داوای لێخۆش بوونی بۆ دەکاتو دەفەرمووێ: خوایە لە فلانە بەندەت خۆشبە، چونکە بە دەست نوێژەوە خەوتووە.

**سوودو ئامۆژگاری ئەم دوو فەرموودەیە:**

(١) هەرکەسێك بە دەست نوێژەوە بخەوێت، ئەوە مەلائیکەتێك لەگەڵ ئەو بەندەیەدایە لەو نوێن و پێخەفەی کە پێی دەخەوێت و دەلکێت بەلاشەیەوەیە (مەگەر موسڵمانێك لەشی گران بێت مەلائیکە لێی دووردەکەوێتەوە تا خۆی دەشوات و غوسڵی خۆی دەردەکات).

---

[١٦] صحيح ابن حبان(١٠٥١) وصححه الالباني في صحيح الترغيب والترهيب(٣٧١)وفي الصحيحة(٢٥٣٩).

(٢) خـوای گـەورە مەلائیکـەتێکی تایبـەت کـردووە بـەو کەسـانەی کـە بـە دەسـت نوێـژەوە دەخـەون، وە ئـەو مەلائیکەتـە داوای لێخۆش بوون بۆ ئەو موسڵمانە دەکات .

وە هـەر لـە فـەزڵ و گـەورەیی دەسـت نوێـژدا، ئیمـامی (أَحْمَد) گێڕاویەتیـەوە لـە (مُعَاذ کـوڕی جَبَل)ـەوە (خـوای لـێ ڕازی بێـت) کـە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: ((مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَبِيتُ عَلَى ذِكْرٍ طَاهِرًا فَيَتَعَارُّ [١٧] مِنَ اللَّيْلِ فَيَسْأَلُ اللَّهَ خَيْرًا مِنَ الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ إِلاَّ أَعْطَاهُ إِيَّاهُ)) [١٨].

واتـە: هـیچ موسـڵمانێك نییـە کـە بـە دەسـت نوێـژەوە دەخـەوێت و شـەو دەکاتـەوە، وە هـەر کاتێـك هەسـتا لـە خـەوو ئـەم دیـوو ئـەو دیـوی کـرد لەسـەر جێگاکـەی و داوای خێـری دونیـاو دواڕۆژی لە خوای پەروەردگار کرد ئیللا خوا پێی دەبەخشێت.

ئـەم فەرموودەیـە سـوودی ئـەوەی تێدایـە کـە: خـەوتن بـە دەسـت نوێـژەوە هۆکـارە بـۆ گیرابـوونی دوعـاو پاڕانـەوەکان، خوای گەورە بمان گێڕێت لەو کەسانە...

---

[١٧] (فَيَتَعَارُّ): ماناى هەستان لە خەوو ئەم ديوو ئەو ديو كردنە لەسەر جێگا (معالم السنن ٤/١٤٣).

[١٨] رواه احمد (٥/٢٣٥) وأبوداود (٢٦٢) وصححه الشيخ الألباني في صحيح سنن أبي داود(٣/٩٥١).

## دووەم : هەرکەسێك دابنیشێتو چاوەڕوانی کاتی نوێژ بکات.

یەکێکی تر لەوانەی کە مەلائیکەتەکان بۆی دەپاڕێنەوە، ئەو کەسانەن کە لە مزگەوت دادەنیشنو چاوەڕێی نوێژ دەکەن.

ئیمامی (مُسْلِم) گێڕاویەتیەوە لە (أَبُو هُرَيرة)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت) کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((أَحَدُكُمْ مَا قَعَدَ يَنْتَظِرُ الصَّلاَةَ فِي صَلاَةٍ مَا لَمْ يُحْدِثْ تَدْعُو لَهُ الْمَلاَئِكَةُ اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ اللَّهُمَّ ارْحَمْهُ)) [١٩].

واتە: یەکێك لەئێوە کاتێك دادەنیشێتو چاوەڕێی نوێژ دەکات، ئەگەر دەست نوێژی هەبێت وە ئازاری کەس نەدات، ئەوا مەلائیکەت دوعای خێری بۆ دەکەن و دەڵێن: خوایە لێی خۆشبەو ڕەحمی پێ بکە.

[١٩] صحيح مسلم باب فضل صلاة الجماعة وانتظار الصلاة (١٥٤٣) .

## سێیەم: هەرکەسێك لە ڕیزی پێشەوەی نوێژی جەماعەت بێت

یەکێکی تر لەو کەسانەی کە مەلائیکەت دوعای بۆ دەکات و بۆی دەپاڕێتەوە، ئەوانەن کە لە ڕیزی پێشەوە نوێژی جەماعەت دەکەن.

ئیمامی (أحمد) گێڕاویەتیەوە لە (بَرَاء)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت) کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((إِنَّ اللَّهَ وَمَلاَئِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى الصَّفِّ الأَوَّلِ)) [٢٠] واتە: خوای گەورە ڕەحمو بەزەیی خۆی دەڕێژێت بەسەر ئەو موسڵمانانەی کە لە ڕیزی پێشەوە نوێژ دەکەن، وە مەلائیکەتەکانیش داوای لێ خۆشبوونیان بۆ دەکەن و بۆ یان دەپاڕێنەوە.

لە فەرموودەیەکە تردا کە ئیمامی (أحمد) گێڕاویەتیەوە لە (أَبُو أُمَامَةَ وە (خوای لێ ڕازی بێت) کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((إِنَّ اللَّهَ وَمَلاَئِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى الصَّفِّ الأَوَّلِ، قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ وَعَلَى الثَّانِي؟ قَالَ: وَعَلَى الثَّانِي)) [٢١].

واتە: خوای گەورە ڕەحمو بەزەیی خۆی دەڕێژێت بەسەر ئەو موسڵمانانەی کە لە ڕیزی پێشەوە نوێژ دەکەن، وە مەلائیکەتەکانیش داوای لێ خۆشبوونیان بۆ دەکەن و بۆ یان دەپاڕێنەوە، ووترا پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەی ڕیزی دووەم؟ فەرمووی ڕیزی دووەمیش.

---

[٢٠] رواه أحمد وأبو داود وابن خزيمة وابن حبان، وصححه الشيخ الألباني في صحيح الجامع (١٨٣٩) .

[٢١] رواه أحمد في المسند (٢٢٩٢٣)، وصححه الشيخ الألباني في صحيح الترغيب والترهيب (٤٩١) .

## چوارەم: هەرکەسێك لە نوێژی جەماعەتدا لە لای ڕاستی ئیمامەوە بێت

یەکێکی تر لەوانەی کە مەلائیکەت دوعای بۆ دەکات و بۆی دەپاڕێتەوە ئەوانەن کە لە نوێژی جەماعەتدا لەلای ڕاستی ئیمامەوە نوێژ دەکەن [٢٢].

ئیمامی (مُسْلِم) گێڕاویەتیەوە لە بَرَاءوە (خوای لێ ڕازی بێت) کە فەرموویەتی: ((كُنَّا إِذَا صَلَّيْنَا خَلْفَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) أَحْبَبْنَا أَنْ نَكُونَ عَنْ يَمِينِهِ يُقْبِلُ عَلَيْنَا بِوَجْهِهِ)) [٢٣].

واتە: ئێمە ئەگەر نوێژمان بکردایە لە دوای پێغەمبەری خواوە (ﷺ) پێمان خۆش بوو لای ڕاستیەوە بین بۆ ئەوەی کە سەلامی دایەوە ڕووی لێمان بێت و ڕوومان تێ بکات.

---

[٢٢] ئیمامی (أبُوداود) گێڕاویەتیەوە لە (عَائِشَةَ)ـەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: «إِنَّ اللَّهَ وَمَلاَئِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَىٰ مَيَامِنِ الصُّفُوفِ» واتە: خوای گەورە ڕەحم و بەزەیی خۆی دەڕێژێت بەسەر ئەو موسڵمانانەی کە لە ڕیزی ڕاستی ئیمامەوە نوێژ دەکەن، وە مەلائیکەتەکانیش داوای لێ خۆش بوونیان بۆ دەکەن و بۆ یان دەپاڕێنەوە، **ئەم فەرموودەیەی نووسەر کردوویەتی بە بەڵگە، بەڵام** (ضعیف)ـەو **کاری پێ ناکرێت، بڕوانە:** ضعیف أبي داود( ١٠٣ ) وضعيف ابن ماجة(١٠٠٥) وضعيف الجامع الصغير (١٦٦٨)، **وە زانای فەرموودەناس شیخی ئەلبانی عیلەتی** (ضعیف)**کەی باسکردووە لە** (ضعيف سنن أبي داود ( رقم ١٠٤) **وەرگێڕ**.

[٢٣] صحيح مسلم (١٦٧٦)، (اسْتِحْبَابِ يَمِينِ الإِمَامِ).

## پێنجەم: گەیاندنی ڕیزە نوێژی جەماعەت بەیەکتری و پڕکردنەوەی بۆشایی

یەکێکی تر لەو کەسانەی کە مەلائیکەت دوعای بۆ دەکات و بۆی دەپاڕێتەوە، ئەوانەن کە ڕیزەکان تەواو دەکەن و بۆشایی پڕدەکەنەو.

دایکی ئیمانداران خاتوو (عائشة) (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((إِنَّ اللَّهَ وَمَلاَئِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى الَّذِينَ يَصِلُونَ الصُّفُوفَ)) [٢٤].

واتە: خوای گەورە ڕەحمو بەزەیی خۆی دەڕێژێت بەسەر ئەو موسڵمانانەی کە ڕیزەکان دەگەیەنن بەیەکو بۆشایی صەفەکان پڕدەکەنەوە، وە مەلائیکەتەکانیش داوای لێ خۆشبوونیان بۆ دەکەنو بۆ یان دەپاڕێنەوە، وە ئیمامی (ابْنُ حِبَّان) ناونیشانێکی داناوە بەناوی (ڕەحمو بەزەیی خوای پەروەردگار لەگەڵ داوای لێ خۆشبوونی مەلائیکەتەکان بۆ ئەوانەی ڕیزەکان دەگەیەنن بەیەک و بۆشایی پڕدەکەنەوە) [٢٥].

---

[٢٤] رواه أحمد(١٠٤٨) وابن ماجة(٩٩٥) وصححه الشيخ الألباني في صحيح الترغيب والترهيب(٥٠١).

[٢٥] بڕوانە: الإحسان في تقريب صحيح ابن حبان(٥/٥٣٦) .

## شەشەم: موسڵمانێك کاتێك دەڵێت (آمین) لە نوێژی جەماعەت.

چەندین بەڵگەی صحیح هەیە لەسەر ئەوەی کە مەلائیکەتەکان ئامین دەکەن لە پاش خوێندنی سورەتی فاتیحەی ئیمام لەوانەش:

هاوەڵی بەڕێز أَبُو هُرَيْرة (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((إِذَا قَالَ الإِمَامُ ﴿غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾ فَقُولُوا آمِينَ، فَإِنَّهُ مَنْ وَافَقَ قَوْلُهُ قَوْلَ الْمَلاَئِكَةِ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ)) [٢٦].

واتە: ئەگەر پێش نوێژ خوێن وتی: ﴿غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾ ئەوا ئێوەش بڵێن: ئامین، چونکە بەڕاستی هەرکەسێك ئامین کردنەکەی لەگەڵ ئامینی مەلائیکەتەکاندا یەك بگرێت، ئەوا خوای پەروەردگار لە گوناهو تاوانەکانی پێشووی خۆش دەبێت [٢٧].

---

[٢٦] رواه البخاري (٧٨٢) .

[٢٧] سەبارەت بە کاتو شوێنی ئامین وتن، زانای پایە بەرز (ابن العثيمين) فەرموویەتی: متى يقول آمين؟ فالجواب: أما الإمامُ فإذا انتهى من قوله: ٱلضَّآلِّينَ وكذلك المنفرد) واتە: ئەگەر ووترا کەی دەبێت (آمین) بکرێت؟ وەڵامەکەی ئەوەیە کە پێش نوێژ خوێن ئەگەر کۆتایی بە سورەتی (الفاتحة هێنا، دوای ووتنی: ٱلضَّآلِّينَ (آمین) دەکات، هەروەها ئەو کەسانەش کە بە تەنها نوێژەکانیان ئەنجا دەدەن، بڕوانە: (الشرح الممتع على زاد المستقنع: ١ / ٥٣٩) **وەرگێڕ** .

وە هەروەها أَبُو هُرَيْرة (خوای لێ ڕازی بێت) فەرموودەیەکی ترمان بۆ دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی:: (( إِذَا قَالَ أَحَدُكُمْ آمِينَ. وَالْمَلاَئِكَةُ فِي السَّمَاءِ آمِينَ فَوَافَقَتْ إِحْدَاهُمَا الأُخْرَى غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ)) [٢٨] واتە: ئەگەر یەکێکتان وتی (ئامین) لە نوێژدا لە دوای تەواو بوونی سورەتی فاتحە ﴿وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴾ وە مەلائیکەتەکان لە ئاسمان وتیان (ئامین)، جا هەرکەسێك (ئامین) وتنەکەی لەگەڵ (ئامین) وتنی مەلائیکەتەکان یەك بگرێت، ئەوە خوای پەروەردگار لە گوناهو تاوانەکانی پێشوی خۆش دەبێت .

**سوودو ئامۆژگاری ئەم دوو فەرموودەیە :**

(١) مەلائیکەتەکان ئامین دەکەن بۆ ئەو کەسانەی لە نوێژی جەماعەتدا لە کۆتایی سورەتی فاتیحەدا ئامین دەکەن.

(٢) مەبەست لە وتنو ئامینی مەلائیکەتەکان، واتە: مەلائیکەتەکان دەفەرموون: پەروەردگار وەڵامیان بدەرەوە.

(٣) مەلائیکەتەکان تکاو شەفاعەت بۆ نوێژ خوێنان دەکەن و بۆیان دەپاڕێنەوە [٢٩].

---

[٢٨] رواه البخاري (٧٨١) ومسلم (٩٤٤-٩٤٥) .

[٢٩] زۆرێك لە خەڵکی توشی هەڵە دەبن لەگەڵ ئیمام یان پێش ئیمام ئامین دەکەن، بێگومان ئەمیش هەڵەیە، چونکە مەلائیکەت لەپاش ئەوەی ئیمام دەڵێت ئامین ئینجا ئامین دەکەن، **وەرگێڕ**.

## حەوتەم: دانیشتن لە دوای نوێژی جەماعەت.

یەکێکی تر لەو کەسانەی کە مەلائیکەتەکان بۆی دەپاڕێنەوە، ئەوانەن کە لە دوای نوێژی جەماعەت دادەنیشن و زیکری خوای پەروەردگار دەکەن.

هاوەڵی بەڕێز أَبُو هُرَيْرة (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((الْمَلائِكَةُ تُصَلِّي عَلَى أَحَدِكُمْ مَا دَامَ فِي مُصَلاَّهُ الَّذِي صَلَّى فِيهِ مَا لَمْ يُحْدِثِ اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ اللَّهُمَّ ارْحَمْهُ)) [٣٠].

واتە: مەلائیکەتەکان دوعاو داوای لێخۆشبوون بۆ ئەو کەسانەتان دکەن، مادام لە مزگەوتدان وە لەو شوێنەدان کە نوێژتان تێیدا ئەنجامداوە، ئەگەر دەست نوێژی هەبێت وە ئازاری کەس نەدات، ئەوا مەلائیکەت دەفەرموون: خوایە لێی خۆشبەو ڕەحمی لێ بکە [٣١].

ئیمامی (الْبُخَارِي) گێڕاویەتیەوە لە أَبُو هُرَيرةوە (خوای لێ ڕازی بێت) کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((فَإِذَا صَلَّى لَمْ تَزَلِ الْمَلاَئِكَةُ

---

[٣٠] رواه احمد في المسند (٨١٠٦) وقال الشيخ احمد شاكر حديث صحيح (هامش المسند ٢/٢٩٢).

[٣١] ئەم فەرموودەیە شێخ ئەلبانی بە (صحیح)ی داناوە لە، صَحيح الجَامع (٦٧٢٧) **وەرگێڕ**.

تُصَلِّي عَلَيْهِ مَا دَامَ فِي مُصَلاَّهُ اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَيْهِ ، اللَّهُمَّ ارْحَمْهُ)) [٣٢].

واتە: ئەگەر موسڵمانێك نوێـژی کـرد لـە مزگـەوت، ئـەوا بـەردەوام مەلائیکەتەکان بۆی دەپاڕێنەوەو داوای لێخـۆش بـوونی بـۆ دەکـەن، مادام لە مزگەوتدان وە لەو شوێنەدان کە نوێژتان تێیدا ئەنجامـداوە، دەفەرموون: خوایە لێی خۆشبەو ڕەحمی لێ بکە .

**دانیشتن لـە مزگـەوت** لـە دوای نوێـژ یەکێکـە لـەو کردەوانـەی کـە مەلائیکەتەکان پێش بڕکێ دەکەن بۆ بەرزکردنەوەی بۆ ئاسمـان، وە هۆکارە بۆ لێخۆش بوونی گونـاهو تـاوان، وە هۆکـارە بـۆ ئـەوەی بـە خۆشیو کامەرانی لە دونیادا ژیان بەسەر بەری.

ئیمامی (التِّرْمِذِيُّ) گێڕاویەتیەوە لە اِبْن عَبَّاس (خوایان لێ ڕازی بێت) کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: خوای پەروەردگار پێمی فەرموو: ((يَا مُحَمَّدُ هَلْ تَدْرِي فِيمَ يَخْتَصِمُ الْمَلأُ الأَعْلَى؟ قُلْتُ: نَعَمْ. قَالَ: فِي الْكَفَّارَاتِ. وَالْكَفَّارَاتُ: الْمُكْثُ فِي الْمَسَاجِدِ بَعْدَ الصَّلَوَاتِ، وَالْمَشْيُ عَلَى الأَقْدَامِ إِلَى الْجَمَاعَاتِ، وَإِسْبَاغُ الْوُضُوءِ فِي الْمَكَارِهِ، وَمَنْ فَعَلَ ذَلِكَ عَاشَ بِخَيْرٍ وَمَاتَ بِخَيْرٍ وَكَانَ مِنْ خَطِيئَتِهِ كَيَوْمَ وَلَدَتْهُ أُمُّهُ)) [٣٣].

---

[٣٢] رواه البخاري (٦٤٧) .

[٣٣] رواه الترمذي(١٧٣) وصححه الشيخ الألباني في صحيح سنن الترمذي(٩٨) .

واتە: ئـەی محمد ئایـا دەزانیـت مەلائیکەتـە نزیکـەکانم بـەدوای چ شتێدا دەگەڕێن‌و پێشبڕکێی لەسەر دەکەن؟

منیش ووتم: بەڵێ ئـەی خـوای پـەروەردگار، ئینجـا پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فـەرمووی: لـە سـڕینەوەکانی تـاوان دەگـەڕێن، وە ئـەو کـارە چاکانەی کە دەبنە کەفارەت و مایەی سڕینەوەی تاوانەکان ئەمانەن: مانــەوەو دانیــشتن لــە دوای نوێــژەکان لــە مزگەوتــدا، وە ڕۆیــشتن‌و هەنگاونان و چوون بۆ مزگەوت و ئەنجامـدانی نوێـژی جەماعـەت، وە دەست نوێژ شۆرین لە کاتی نـا ڕەحەتیـدا، جـا هـەر کەسـێك ئەوانـە ئەنجام بدات ئەوا بە خێرو خۆشـی دەژێـت‌و بەخۆشـی دەمرێـت‌و لـە گوناهو تاوان پاك دەبێتەوە وەك ئەو ڕۆژەی کە لە دایك بووە.

**دوو پرسیار سەبارەت بەدانیشتن لە مزگەوت دوای نوێژەکان؟**

**یەکەم:** ئایا بۆ بە دەسـتهێنانی دوعـاو پاڕانـەوەی مەلائیکەتـەکان مەرجە لەو شوێنە دابنیشیت کە نوێژەکـەت تێیـدا ئەنجامـداوە، یـان ئەگەر شوێنەکەش بگۆڕیت لە نـاو مزگەوتەکـەدا لـەو پاڕانەوەیـە بـێ بەش دەبیت؟

**وەڵام:** زانای پایەبەرز (إِبْن حَجَر) (ڕەحمـەتی خـوای لێبێـت) لـە ڕاڤەی (فِي مُصَلاه)دا فەرموویەتی: ئەو شوێنەیە کـە نوێژەکـەی تێـدا

ئەنجامداوە، بەڵام ئەگەر نییەتی ئەوە بێت ئەوا شوێنەکەشی بگۆڕێت لە ناو مزگەوتەکەدا ئەو خێرو پاداشتەی بۆ دەنوسرێت [٣٤].

**دووەم:** ئایا ئەگەر ئافرەتان لەماڵەوە دوای ئەنجامدانی نوێژەکانیان دابنیشن ئەوا ئەو فەرموودانە ئەوانیش دەگرێتەوەو ئەو خێرو پاداشتو پاڕانەوەیەیان بۆ دەنووسرێت؟

**وەڵامێکی نزیک لەم بارەیەوە:** زانای پایەبەرز (إبن باز) (ڕەحمەتی خوای لێبێت) ووتوویەتی: بەهەمان شێوە ئەگەر ئافرەتیش لە دوای نوێژی بەیانی دانیشتو قورئانی خوێندو زیکری خوای پەروەردگاری کرد تاکو دەرکەوتنو بەرز بوونەوەی خۆر، پاشان دوو ڕکاعەت نوێژ بکات ئەوە ئەو خێرو پاداشتو پاڕانەوەیەیان بۆ دەنووسرێت کە لە فەرموودەکاندا باسکراوە [٣٥].

---

[٣٤] فتح الباري شرح صحيح البخاري (٢/١٣٦) .

[٣٥] بڕوانە: مجموع فتاوى ومقالات متنوعة لسماحة الشيخ عبد العزيز بن باز(١١/٤٠٣-٤٠٤).

## هەشتەم: ئەنجامدانی نوێژی بەیانیو عەسر بە جەماعەت

یەکێکی تر لەو انەی کە مەلائیکەتەکان بۆی دەپاڕێنەوە، ئەوانەن کە نوێژی عەسرو نوێژی بەیانی بە جەماعەت ئەنجام دەدەن.

ئیمامی (أحمد) گێڕاویەتیەوە لە أَبُو هُرَيرةوە (خوای لێ ڕازی بێت) کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (( تَجْتَمِعُ مَلاَئِكَةُ اللَّيْلِ وَمَلاَئِكَةُ النَّهَارِ فِي صَلاَةِ الْفَجْرِ وَصَلاَةِ الْعَصْرِ، فَيَجْتَمِعُونَ فِي صَلاَةِ الْفَجْرِ، فَتَصْعَدُ مَلاَئِكَةُ اللَّيْلِ وَتَثْبُتُ مَلاَئِكَةُ النَّهَارِ، وَيَجْتَمِعُونَ فِي صَلاَةِ الْعَصْرِ، فَتَصْعَدُ مَلاَئِكَةُ النَّهَارِ وَتَثْبُتُ مَلاَئِكَةُ اللَّيْلِ، فَيَسْأَلُهُمْ رَبُّهُمْ كَيْفَ تَرَكْتُمْ عِبَادِي، فَيَقُولُونَ أَتَيْنَاهُمْ وَهُمْ يُصَلُّونَ، وَتَرَكْنَاهُمْ وَهُمْ يُصَلُّونَ «فَاغْفِرْ لَهُمْ يَوْمَ الدِّينِ»)) [٣٦].

واتە: مەلائیکەتەکانی شەوو مەلائیکەتەکانی ڕۆژ کۆدەبنەوەو بەیەك دەگەن، لە کاتی نوێژی بەیانیو نوێژی عەسردا، جا کاتێك کە بەیەك دەگەنو کۆدەبنەوە لە نوێژی بەیانیدا، ئەوا مەلائیکەتەکانی شەو سەر دەکەونو بەرز دەبنەوەو مەلائیکەتەکانی ڕۆژ جێگیر دەبن، وە کاتێك کە بەیەك دەگەنو کۆ دەبنەوە لە نوێژی عەسردا، مەلائیکەتەکانی ڕۆژ سەر دەکەونو بەرز دەبنەوەو مەلائیکەتەکانی

---

[٣٦] رواه أحمد (٩١٤٠) و ابن خُزيمة (٣٢٢) و ابنُ حِبَّان (٢٠٦١) وصححه الشيخ شاكر.

شەو جێگیر دەبن، ئنجا پرسیاریان لیَ دەکات پەروەردگاریان کە چۆن بەندەکانی منتان بە جیَ هێشت، ئەوانیش، لەوەڵامدا دەفەرموون: کاتێك لەلایان بووین ئەوان نوێژیان دەکرد، وە کاتێکیش بەجێیانمان هێشت ئەوان نوێژیان دەکرد، پەروەردگار لە گوناهو تاوانەکانیان خۆشبە لە ڕۆژی دوایدا [٣٧].

ئیمامی (إبنُ خُزيمة ) (ڕەحمەتی خوای لێبێت) ناونیشانێکی داناوە لەسەر ئەم فەرموودەیە، بە ناوی کۆ بوونەوەی مەلائیکەتەکانی شەوو ڕۆژ لە نوێژی بەیانیو نوێژی عەسردا، وە پاڕانەوەی مەلائیکەتەکان بۆ ئەو کەسانەی کە ئامادەی دەبن [٣٨].

هەروەها ئیمامی (إبنُ حِبَّان) باسێکی داناوە لە صحیحەکەیدا بەناوی مەلائیکەتەکان داوای لێخۆشبوون دەکەن بۆ ئەو کەسانەی کە ئامادەی نوێژی بەیانیانو عەسران دەبن [٣٩].

---

[٣٧] ئەم فەرموودەیە شێخ ئەلبانی بە(صحیح)ی داناوە لە صَحِیح الترغیب والترهي(٤٦٣) **وەرگێڕ**.

[٣٨] صحیح ابن خزیمة (١/١٦٥) .

[٣٩] بڕوانە: الإحسان في تقريب صحيح ابن حبان (٥/٤٠٩) .

## نۆیەم: صەڵاواتدان لەسەر پێغەمبەری خوا (ﷺ)

یەکێکی تر لەو کەسانەی کە مەلائیکەتەکان دوعای بۆ دەکەن و بۆی دەپاڕێنەوە، ئەوانەن کە صەڵاوات دەدەن لەسەر پێغەمبەری خوا (ﷺ)[٤٠].

هاوەڵی خۆشەویست أُبَيٌّ بن كَعْب (رضي الله عنه) بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموو: (يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي أُكْثِرُ الصَّلاَةَ عَلَيْكَ فَكَمْ أَجْعَلُ لَكَ مِنْ صَلاَتِي فَقَالَ: مَا شِئْتَ، قَالَ: قُلْتُ الرُّبُعَ. قَالَ: مَا شِئْتَ، فَإِنْ زِدْتَ فَهُوَ خَيْرٌ لَكَ، قُلْتُ النِّصْفَ. قَالَ: مَا شِئْتَ فَإِنْ زِدْتَ فَهُوَ خَيْرٌ لَكَ. قَالَ: قُلْتُ فَالثُّلُثَيْنِ قَالَ: مَا شِئْتَ فَإِنْ زِدْتَ فَهُوَ خَيْرٌ لَكَ، قُلْتُ: أَجْعَلُ لَكَ صَلاَتِي كُلَّهَا. قَالَ: «إِذًا تُكْفَى هَمَّكَ وَيُغْفَرُ لَكَ ذَنْبُكَ»[٤١].

---

[٤٠] ئیمامی (أحمد) گێڕاویەتیەوە لە (عَبْد اللَّه بْن عَمْرو(رَضِيَ اللَّه عَنْهُمَا) وە کە فەرموویەتی: « مَنْ صَلَّى عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) صَلاَةً صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَمَلاَئِكَتُهُ سَبْعِينَ صَلاَةً فَلْيُقِلَّ عَبْدٌ مِنْ ذَلِكَ أَوْ لِيُكْثِرْ » واتە: هەرکەسێك یەك سەڵاوات بدات لەسەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوا خوای گەورە ڕەحمو بەزەیی خۆی دەڕێژێت بەسەر ئەو بەندەیەدا، وە حەفتا هەزار مەلائیکەت بۆ ئەو کەسە دەپاڕێنەوەو داوای لێخۆشبوونی بۆ دەکەن، جا بابەندە زۆر سەڵاوات بدات لەسەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) **ئەم فەرموودەیە نووسەر کردویەتی بە بەڵگە، بەڵام**(ضعیف)**ـەو کاری پێ ناکرێت، بڕوانە:** ضعيف مشكاة المصابيح (٩٣٥) وضعيف الترغيب والترهيب(١٠٣٠) **وەرگێڕ**.

[٤١] رواه الترمذي (٧/١٢٩-١٣٠) و حسنه الشيخ الألباني في صحيح سنن الترمذي (٢/٢٩٩).

واتە: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) من زۆر صەڵاوات لەسەر تۆ دەدەم، چەندی کاتم بە صەڵاواتدان لەسەر تۆ ببەمەسەر، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: بەویستی خۆت، أُبَيّ کوڕی کَعب (خوای لێ ڕازی بێت) فەرمووی: چوار یەکی کاتەکانم بە صەڵاواتدان لەسەر تۆ دەبەمەسەر، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: بەویستی خۆت، ئەگەر زیاتربێت ئەوە باشترو خێرترە بۆت، أُبَيّ کوڕی کَعب (خوای لێ ڕازی بێت) فەرمووی: نیوەی کاتەکانم بە صەڵاواتدان لەسەر تۆ دەبەمەسەر، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: بەویستی خۆت، ئەگەر زیاتربێت ئەوا باشترو خێرترە بۆت، أُبَيّ کوڕی کَعب (خوای لێ ڕازی بێت) فەرمووی: دوو لەسەر سێ (لە نیوە زیاتر)ی کاتەکانم بە صەڵاواتدان لەسەر تۆ دەبەمەسەر، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: بەویستی خۆت، ئەگەر زیاتربێت ئەوا باشترو خێرترە بۆت، أُبَيّ کوڕی کَعب (خوای لێ ڕازی بێت) فەرمووی: هەموو کاتەکانم بە صەڵاواتدان لەسەر تۆ دەبەمەسەر، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەگەر تۆ زۆربەی کاتەکانت بەسەڵاوات دان لەسەرمن بەسەر بەری ئەوا مەبەستی دونیاو دواڕۆژت دێتەدیو **خەمو خەفەتت نامێنێتو** پەروەردگار لە تاوانەکانت خۆش دەبێت .

هەرکەسێك پێی خۆشە زانیاری زیاتری هەبێت لەسەر سودو پاداشتی صەڵاواتدان لەسەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوە با بگەڕێتەوە بۆ کتێبی (جَلاءُ الأفهامِ في الصَّلاةِ والسَّلامِ عَلى خَيْرِ الأَنَام، لِلْحَافِظِ اِبْن الْقَيِّم).

## دەیەم: هەرکەسێك بۆ برایەکی موسڵمانی بپاڕێتەوە لە پاشملە

یەکێکی تر لەو سەرفرازانەی کە مەلائیکەتەکان بۆی دەپاڕێنەوە، ئەوانەن کە بۆ برای موسڵمانی خۆیان دپاڕێنەوە لە پاشملە.

ئیمامی (مُسْلِم) گێڕاویەتیەوە لە أُمُّ الدَّرْدَاءوە (خوای لێ ڕازی بێت) کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((دَعْوَةُ الْمَرْءِ الْمُسْلِمِ لأَخِيهِ بِظَهْرِ الْغَيْبِ مُسْتَجَابَةٌ عِنْدَ رَأْسِهِ مَلَكٌ مُوَكَّلٌ كُلَّمَا دَعَا لأَخِيهِ بِخَيْرٍ قَالَ الْمَلَكُ الْمُوَكَّلُ بِهِ آمِينَ وَلَكَ بِمِثْلٍ ))[٤٢].

واتە: دوعاو پاڕانەوەی موسڵمان بۆ برای موسڵمانی لە پاشملەو لە کاتی دیار نەبوونیدا وەڵام دراوەیەو قەبووڵە، لە لای سەری مەلائیکەتێك هەیە سپێردراوە بەوەی هەر کاتێك بپاڕیتەوە بە خێر بۆ برای موسڵمانی، ئەوە ئەو مەلائیکەتە دەفەرموێت: ئامین خوایە وەڵامی بدەرەوەو بە ئەندازەی ئەویش بۆ خۆی .

**لەم فەرموودەیەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە خەڵکی دوو جۆرن.**

**جۆری یەکەم:** ئەوانەن کە دوعاو پاڕانەوەیان بۆ دەکرێت لەلایەن برای موسڵمانانیانەوە لە پاشملە، وە مەلائیکەتیش دەفەرمووێ: ئامین. خوایە وەڵامی بدەرەوە.

---

[٤٢] رواه مسلم (٧١٠٥) .

**جۆری دووەم:** ئەوانەن کە دە پاڕێنەوە بۆ برای موسڵمانیان لە پاشملە، مەلائیکەتیش دەفەرمووێ: خوایە بە ئەندازەی ئەو دوعاو پاڕانەوەیە بۆ خۆی ببێت.

ئیمامی (النَّوَوي) فەرموویەتی: لەم فەرموودەیەدا فەزڵو پاداشتی دوعاو پاڕانەوە بۆ برای موسڵمان لە پاشملە، وە ئەگەر کەسێك بپاڕێتەوە بۆ کۆمەڵێك موسڵمان ئەوا هەموو ئەو فەزڵ و پاداشتە بەدەست دەهێنێت [٤٣].

وە هەندێك لە پیاوچاکانی پێشینی ئەم ئوممەتە ئەگەر ویستی دوعاو پاڕانەوەیەکی هەبوایە ئەوا بۆ برای موسڵمانی دەپاڕایەوە بۆ ئەوەی ئەو دوعایە بۆ خۆی و برای موسڵمانی وەڵام بدرێتەوە [٤٤].

ئیمامی (الذَّهَبي) گێڕاویەتیەوە لە أُمُّ الدَّرْدَاءوە (خوای لێ ڕازی بێت) کە أَبُو الدَّرداء (خوای لێ ڕازی بێت) (٣٦٠) دۆست و خۆشەویستی لەبەر خوای هەبووەو بۆیان دەپاڕایەوە لە نوێژدا، وە دەیفەرموو: ئایا پێت خۆش نییە مەلائیکەتەکان بۆم بپاڕێنەوە [٤٥].

---

[٤٣] بڕوانە: شرح النووي على صحيح مسلم (٩٤/١٧) .

[٤٤] بڕوانە: شرح النووي على صحيح مسلم (٩٤/١٧) .

[٤٥] بڕوانە: سير أعلام النبلاء (٣٥١/٢) .

## یانزەیەم: هەرکەسێك ماڵو سامان ببەخشێت لە پێناوی خوادا

یەکێکی تر لەوانەی کە مەلائیکەتەکان دوعای بۆ دەکەنو بۆی دەپاڕێنەوە، ئەوانەن کە لە پێناوی خوادا ماڵو سامان دەبەخشن.

ئیمامی (الْبُخَارِي وَمُسْلِم) گێڕاویانەتەوە لە أَبُو هُرَيْرَةوە (خوای لێ ڕازی بێت) کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((مَا مِنْ يَوْمٍ يُصْبِحُ الْعِبَادُ فِيهِ إِلاَّ مَلَكَانِ يَنْزِلاَنِ فَيَقُولُ أَحَدُهُمَا اللَّهُمَّ أَعْطِ مُنْفِقًا خَلَفًا، وَيَقُولُ الآخَرُ اللَّهُمَّ أَعْطِ مُمْسِكًا تَلَفًا)) [٤٦].

واتە: هیچ ڕۆژێ نییە کە بەندەکان ڕۆژیان لێ دەبێتەوە، دوو مەلائیکەت دێنە خوارەوە، یەکێکیان دەفەرمووێ: خوادیە ببەخشە بەو کەسەی کە دەبەخشێت لەبەر خاتری تۆ وە جێگای ئەوەشی بۆ پڕ بکەرەوە کەبەخشیویتی، ئەوەی تریان دەڵێت: ئەی خوایە ئەوکەسەی دەستی گرتۆتەوەو نابەخشێتو چروکە ماڵەکەی لێ بگرەوەو لەناوی بەرە.

ئیمامی(أحمد) گێڕاویەتیەوە لە أَبُو الدَّرداءەوە (خوای لێ ڕازی بێت) کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((مَا طَلَعَتْ شَمْسٌ قَطُّ إِلاَّ بُعِثَ بِجَنْبَتَيْهَا مَلَكَانِ يُنَادِيَانِ يُسْمِعَانِ أَهْلَ الأَرْضِ إِلاَّ الثَّقَلَيْنِ يَا أَيُّهَا

---

[٤٦] رواه البخاري كتاب الزكاة(١١٤٢) ومسلم كتاب الزكاة (١٠١٠) .

النَّاسُ! هَلُمُّوا إِلَى رَبِّكُمْ، فَإِنَّ مَا قَلَّ وَكَفَى خَيْرٌ مِمَّا كَثُرَ وَأَلْهَى، وَلاَ آبَتْ شَمْسٌ قَطُّ إِلاَّ بُعِثَ بِجَنْبَتَيْهَا مَلَكَانِ يُنَادِيَانِ يُسْمِعَانِ أَهْلَ الأَرْضِ إِلاَّ الثَّقَلَيْنِ اللَّهُمَّ أَعْطِ مُنْفِقاً خَلَفاً وَأَعْطِ مُمْسِكاً مَالاً تَلَفاً)) [٤٧].

واتە: هیچ ڕۆژێك نییە کە خۆر تێیدا هەڵ هاتبێ ئیللا لە تەنیشتیدا دوو مەلائیکەت نێردراوەو بانگ دەکەن، جا هەرچی لەسەر زەوییە گوێیان لەو بانگە دەبێت، جگە لە مرۆڤ و جن، دەفەرموون: ئەی خەڵکینە! وەرن بۆلای پەروەردگارتان، چونکە بەڕاستی ئەو ماڵ و سامانەی کەم بێت و بەشت بکات باشترە لەوەی کە زۆر بێت و سەرقاڵ و بێ ئاگات بکات لە پەرستنی خوای گەورە، وە هیچ ڕۆژێك خۆری تێدا نەگەڕاوەتەوە ئیللا لەتەنیشتیدا دوو مەلائیکەت نێردراوەو بانگ دەکەن، جا هەرچی لەسەر زەوییە گوێیان لەو بانگە دەبێت، جگەلە مرۆڤ و جن، دەفەرموون: خوادیە ببەخشە بەو کەسەی کە دەبەخشێت لەبەر خاتری تۆ وە جێگای ئەوەشی بۆ پڕ بکەرەوە کە بەخشیوێتی، وە ئەوکەسەی دەستی گرتۆتەوەو نابەخشێتو چروکە ماڵەکەی لێ بگرەوەو لەناوی بەرە.

---

[٤٧] رواه احمد وابن حبان وصححه الألباني في الصحيحة(٤٤٣) وفي صحيح الترغيب والترهيب(١٧٠٦).

## دوانزەیەم: هەرکەسێك بەڕۆژوو بێت و پارش شێو بکات

یەکێکی تر لەو کەسانەی کە مەلائیکەتەکان دوعای بۆ دەکەن‌و بۆی دەپاڕێنەوە، ئەوانەن کە پاش شێوان هەڵ دەستن‌و بەڕۆژوو دەبن.

ئیمامی (ابْنُ حِبَّان) گێڕاویەتیەوە لە ابْنُ عُمَرەوە (خوایان لێ ڕازی بێت) کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((إِنَّ اللَّه وَمَلاَئِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى الْمُتَسَحِّرِين)) [٤٨].

واتە: بەڕاستی خوای پەروەردگار لای مەلائیکەتەکان مەدحی ئەوکەسانە دەکات کە پاش شێوان هەڵدەستن و بەڕۆژوو دەبن، وە مەلائیکەتەکانیش داوای لێخۆش بوونیان بۆ دەکەن و بۆیان دە پاڕێنەوە .

وە ئیمامی (ابْنُ حِبَّان) باسێکی داناوە لە صحیحەکەیدا بەناوی لێخۆشبوونی پەروەردگار، وە پاڕانەوەی مەلائیکەتەکان بۆ ئەوانەی پارش شێو دەکەن [٤٩].

ئیمامی (أحمد) گێڕاویەتیەوە لە أَبُو سَعِيد الْخُدْرِي (خوای لێ ڕازی

---

[٤٨] رواه ابن حبان والطبراني، وصححه الشيخ الألباني في صحيح الترغيب والترهيب (٥١٩) .

[٤٩] بروانە: الإحسان في تقريب صحيح ابن حبان (٢٤٥/٨) .

بێت) کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((السُّحُورُ أَكْلُهُ بَرَكَةٌ فَلاَ تَدَعُوهُ وَلَوْ أَنْ يَجْرَعَ أَحَدُكُمْ جَرْعَةً مِنْ مَاءٍ فَإِنَّ اللَّهَ وَمَلاَئِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى الْمُتَسَحِّرِينَ)) [٥٠].

واتە: پارش شێو کردن خواردنێکی بەبەرەکەتە، نەکەن لە دەستی بدەن، ئەگەر تەنها بە خواردنەوەی قومێك ئاویش بێت، چونکە بەڕاستی خوای پەروەردگار لای مەلائیکەتەکان مەدحی ئەوکەسانە دەکات کە پارش شێوان هەڵ دەستن بۆ بەڕۆژوو بوون، وە مەلائیکەتەکانیش داوای لێخۆش بوونیان بۆ دەکەن و بۆیان دە پاڕێنەوە.

---

[٥٠] رواه احمد (١١٧٠٦) وصححه الشيخ الألباني في صحيح الترغيب والترهيب (١٠٧٠) .

## سیانزەیەم : پاڕانەوەی میوانێکی بەڕۆژوو بۆ خاوەن ماڵ

یەکێکی تر لەوانەی کە مەلائیکەتەکان بۆی دەپاڕێنەوە، ئەوانەن کە خواردنو بەربانگ بۆ ڕۆژووان ئامادە دەکەن[٥١] .

ئیمامی (إبنُ خُزیمة) ناونیشانێکی داناوە بە ناوی: پاڕانەوەی مەلائیکەتەکان بۆ ئەو کەسانەی کە بەربانگ بۆ ڕۆژووانان ئامادەدەکەن و لایان بەربانگ دەکەنەوە .

هەروەها ئیمامی(ابْنُ حِبَّان) باسێکی داناوە بەناوی: پاڕانەوەی مەلائیکەتەکان بۆ ئەو کەسانەی کەڕۆژووانان بەربانگیان لادەکەنەوە.

---

[٥١] ئیمامی (أحمد) گێڕاویەتیەوە لە (أُمِّ عُمَارَةَ(رَضِيَ اللَّه عَنْهَا) وە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاتووە بۆلای، وە چەند پیاوێك لە قەومەکەی (أُمِّ عُمَارَةَ(رَضِيَ اللَّه عَنْهَا) لای بوون، ئنجا خورمای بۆ بردن تاکو بیخۆن، وە ئەوانیش خواردیانو یەکێك لەو پیاوانە کۆکی، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ئەوە چیەتی؟ ئەویش ووتی: من بەڕۆژووم، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: «أَمَا إِنَّهُ مَا مِنْ صَائِمٍ يَأْكُلُ عِنْدَهُ مَفَاطِيرُ إِلاَّ صَلَّتْ عَلَيْهِ الْمَلاَئِكَةُ حَتَّى يَقُومُوا» واتە: بەلام هەرکەسێك ڕۆژووان لەلای بەربانگ بکاتەوە، ئەوا مەلائیکەتەکان بۆی دەپاڕێنەوەو دوعای بۆ دەکەن تاکو هەڵدەستن، **ئەم فەرموودەیەی نووسەر کردویەتی بە بەلگە، بەلام** (ضعیف)**ـەو کاری پێ ناکرێت، بڕوانە:** ضعیف الترمذي ( ٧٨٤ ) وضعیف ابن ماجة (١٧٨٤) وضعیف الجامع الصغیر (١٤٨٣)، **وە زانای فەرموودەناس شیخی ئەلبانی عیلەتی** (ضعیف)**کەی باسکردووە لە** (ضعیف سنن الترمذي (١/٩١) **وە لە** سلسلة الأحادیث الضعیفة (٣/٥٠٢) **بەلام فەرموودەی صحیح هەیە کە**(سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ رضي الله عنه) فەرمووی: ئەگەر پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەربانگی لەلای هەرکەسێك بکردایەتەوە ئەوا دەیفەرموو: «أَكَلَ طَعَامَكُمُ الأَبْرَارُ وَصَلَّتْ عَلَيْكُمُ الْمَلاَئِكَةُ وَأَفْطَرَ عِنْدَكُمُ الصَّائِمُونَ» واتە: پیاو چاکان خواردنتان بخۆنو مەلائیکەتەکان بۆتان بپاڕێنەوەو ڕۆژووانیش لاتان بەربانگ بکەنەوە. رواه أحمد وابو داود وابن ماجة، وصححه الشیخ الألباني في صحیح سنن أبي داود(٣٨٥٤) **وەرگێڕ** .

## چواردەیەم: هەرکەسێك سەردانی نەخۆش بکات

یەکێکی تر لەوانەی کە مەلائیکەتەکان بۆی دەپاڕێنەوە، ئەوانەن کە سەردانی نەخۆشی موسڵمانان دەکەن‌و بەسەریان دەکەنەوە.

ئیمامی (أحمد) گێڕاویەتیەوە لە ئیمامی عَلي (خوای لێ ڕازی بێت) کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((مَا مِنْ مُسْلِمٍ عَادَ أَخَاهُ إِلاَّ ابْتَعَثَ اللَّهُ لَهُ سَبْعِينَ أَلْفَ مَلَكٍ يُصَلُّونَ عَلَيْهِ مِنْ أَيِّ سَاعَاتِ النَّهَارِ كَانَ حَتَّى يُمْسِيَ وَمِنْ أَيِّ سَاعَاتِ اللَّيْلِ كَانَ حَتَّى يُصْبِحَ)) [٥٢].

واتە: هیچ موسڵمانێك نییە کە سەردانی برایەکی موسڵمانی بکات کە نەخۆش بێت، ئیللا خوای پەروەردگار حەفتا هەزار مەلائیکەت دەنێرێت دووعای خێری بۆ دەکەن‌و بۆی بپاڕێنەوە، ئنجا لە هەر کاتێکی ڕۆژدا بێت تاوەکو شەو دادێ، یان لە هەر کاتێکی شەودابێت تاوەکو ڕۆژ دادێ.

وە هەروەها ئیمامی (أحمد) فەرموودەیەکی تری گێڕاوەتەوە لە ئیمامی عَلي (خوای لێ ڕازی بێت) کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَعُود مُسْلِمًا غَدْوَة إِلاَّ صَلَّى عَلَيْهِ سَبْعُونَ أَلْفَ مَلَك حَتَّى يُمْسِي وَإِنْ عَادَ عَشِيَّة إِلاَّ صَلَّى عَلَيْهِ سَبْعُونَ أَلْف مَلَك

---

[٥٢] رواه احمد وابن حبان وصححه الشيخ الألباني في صحيح الترغيب والترهيب (٣٤٧٦) .

حَتَّى يُصْبِحَ وَكَانَ لَهُ خَرِيفٌ فِي الْجَنَّةِ)) [٥٣]

واتە: هیچ موسڵمانێك نییە كە سەردانی موسڵمانێكی نەخۆش بكات لە بەیانیدا ئیللا حەفتا هەزار مەلائیكەت بۆی دەپارێنەوەو داوای لێخۆش بوونی بۆ دەكەن تاكو ئێوارە، وە ئەگەر لە ئێوارەدا سەردانی بكات ئەوا حەفتا هەزار مەلائیكەت بۆی دەپارێنەوەو داوای لێخۆش بوونی بۆ دەكەن تاكو بەیانی، وە باخێكی لە بەهەشتدا پێدەبەخشرێت.

[٥٣] رواه احمد (٩٧٥) والترمذي (٩٦٩) وصححه الشيخ الألباني في صحيح الجامع (٥٧٦٧)

## پانزەیەم: هەرکەسێك قسەی خێر بکات لەسەر نەخۆش یان لەسەر مردوو

یەکێکی تر لەو سەرفرازو بەختەوەرانەی کە مەلائیکەتەکان بۆی دەپاڕێنەوە، ئەوانەن کە قسەی خێر دەکەن لەسەر نەخۆش یان مردوو.

ئیمامی (مُسلِم) گێڕاویەتیەوە لە أُمُّ سَلَمَةوە (خوای لێ ڕازی بێت) کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((إِذَا حَضَرْتُمُ الْمَرِيضَ أَوِ الْمَيِّتَ فَقُولُوا خَيْرًا فَإِنَّ الْمَلائِكَةَ يُؤَمِّنُونَ عَلَى مَا تَقُولُونَ)) [٥٤].

واتە: کاتێك کە دەچن بۆلای نەخۆش یان ئامادەی جەنازەی مردوویەك بوون ئەوە قسەی خێرو باش بکەن، چونکە هەرچی ئێوە بیلێن مەلائیکەتەکان ئامینی لەسەر دەکەن .

---

[٥٤] رواه مسلم (٢١٦٨) واحمد (٢٧٢٥٤) والترمذي (٩٩٣) .

## شانزەیەم: هەرکەسێك خەڵكی فێری كاری خێرو چاك بكات

یەکێکی تر لەوانەی کە مەلائیکەتەکان بۆی دەپاڕێنەوەو دوعای بۆدەکەن، ئەوانەن کە خەڵکی فێری کاری خێرو باشو چاك دەکەن.

ئیمامی (التِّرْمِذِيّ) گێڕاویەتیەوە لە أبُو أُمَامَةَوە (خوای لێ ڕازی بێت) کە فەرمووی: باسی دوو پیاوکرا بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) یەکێکیان خواپەرست و ئەوەی تریشیان زانا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((فَضْلُ الْعَالِمِ عَلَى الْعَابِدِ كَفَضْلِي عَلَى أَدْنَاكُمْ » ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) «إِنَّ اللَّهَ وَمَلاَئِكَتَهُ وَأَهْلَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ حَتَّى النَّمْلَةَ فِي جُحْرِهَا وَحَتَّى الْحُوتَ لَيُصَلُّونَ عَلَى مُعَلِّمِ النَّاسِ الْخَيْرَ)) [٥٥].

واتە: فەزڵو پلەو پایەی زانا بەسەر خوا پەرستەوە، وەك فەزڵی من وایە بەسەر نزمترین کەس لەئێوە، پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: خوای گەورە باسی زاناکان دەکات بەچاکە لەلای مەلائیکەتەکان، وە مەلائیکەتەکانو ئەوەی لە ئاسمانەکاندایەو ئەوەی لە زەوییەکاندایەو تەنانەت مێرولەش لە ناو کونەکەیدا وە حوتیش داوای ڕەحمەت و لێخۆش بوون بۆ ئەو کەسە دەکەن کە خەڵك فێری خێرو چاکە دەکات.

---

[٥٥] رواه الترمذي وصححه الشيخ الألباني في صحيح سنن الترمذي(٢٦٨٥) وفي صحيح الجامع(٤٢١٣).

## حەڤدەیەم: هەرکەسێك تەوبە بکات و بگەڕێتەوە بۆ لای خوای گەورە

یەکێکی تر لەوانەی کە مەلائیکەتەکان بۆی دەپاڕێنەوەو دوعای بۆدەکەن، ئەوانەن کە تەوبە دەکەن و دەگەڕێنەوە بۆ لای خوای گەورە.

خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿ٱلَّذِينَ يَحۡمِلُونَ ٱلۡعَرۡشَ وَمَنۡ حَوۡلَهُۥ يُسَبِّحُونَ بِحَمۡدِ رَبِّهِمۡ وَيُؤۡمِنُونَ بِهِۦ وَيَسۡتَغۡفِرُونَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ رَبَّنَا وَسِعۡتَ كُلَّ شَيۡءٖ رَّحۡمَةٗ وَعِلۡمٗا فَٱغۡفِرۡ لِلَّذِينَ تَابُواْ وَٱتَّبَعُواْ سَبِيلَكَ وَقِهِمۡ عَذَابَ ٱلۡجَحِيمِ ﴿٧﴾ رَبَّنَا وَأَدۡخِلۡهُمۡ جَنَّٰتِ عَدۡنٍ ٱلَّتِي وَعَدتَّهُمۡ وَمَن صَلَحَ مِنۡ ءَابَآئِهِمۡ وَأَزۡوَٰجِهِمۡ وَذُرِّيَّٰتِهِمۡۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٨﴾ وَقِهِمُ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ وَمَن تَقِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ يَوۡمَئِذٖ فَقَدۡ رَحِمۡتَهُۥۚ وَذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿٩﴾﴾ (غافر: ٧- ٩).

واتە: ئەو مەلائیکەتانەی کە عەرشی خوای پەروەردگار هەڵدەگرن، وە ئەوانەش کە لە دەورین و تەسبیحات و ستایش و سوپاسی خوای پەروەردگار دەکەن، ئیمان و باوەڕی زۆر بەهێز و دامەزراویان پێیەتی، وە دوای لێخۆشبوون دەکەن بۆ ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوەو دەڵێن: پەروەردگارا ڕەحمەت و میهرەبانی تۆ زانست و زانیاری تۆ هەموو شتێکی پێ گرتۆتەوە، خۆشببە لەوانەی کە تەوبەیان کردووەو لە گوناهەکانیان پەشیمانن و شوێن بەرنامەو ڕێبازی تۆ دەکەون، وە لە ئاگری دۆزەخیش بیان پارێزە.

پەروەردگارا بیان خەرە ئەو باخو باخاتەی بەهەشتەوە کە بەڵێنت پێداون، هاوڕێ لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە چاکە خوازن، لە باوكو دایكو هاوسەرانو نەوەکانیان، بەڕاستی هەر تۆ خوایەکی باڵا دەستو دانایت، وە لە تۆڵەی هەموو گوناهەکان بیان پارێزە، وە هەرکەسێك لە تۆڵەی گوناهەکان بپارێزیت لە ڕۆژی دوایدا، ئەوە بەڕاستی تۆ ڕەحمت پێکردووە، هەر ئەوەشە سەر فرازیو سەرکەوتنی گەورەو بێ سنوور .

**چەند ڕوونکردنەوەیەك لەم ئایەتە پیرۆزانەدا :**

**یەکەم:** ئەو مەلائیکەتانەی کە لەم ئایەتەدا باسکراون ( **هەڵگری عەرشی خوای گەورەنو ئەوانەی لە دەورین** ) دەپاڕێنەوە بۆ باوەڕداران، کە ئەوانە بەڕێزترینی مەلائیکەتەکانن، وەك ئیمامی (القُرطُبِي) وتوویەتی [٥٦]

وە زانای پایە بەرز شێخ (السَّعْدِي) وتوویەتی: ئەو مەلائیکەتانەی کە خوای گەورە هەڵگرتنی عەرشی گەورەی پێسپاردوون، هیچ گومانێکی تێدانییە کە لە گەورەترین و بەهێزترینی مەلائیکەتەکانن،

---

[٥٦] بڕوانە: تفسير القرطبي (١٥/٢٩٤) .

بۆیە باسکردنیان بەوەی کە نزیکن لە خوای گەورەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە چاکترین جۆری مەلائیکەتن[٥٧].

**دووەم:** بەدڵنیایی ئەوانەی کە دوعاو پاڕانەوەی ئەم مەلائیکەتانەیان بۆ گیرا دەبێت، بە سێ شێوە وەسف کراون، ئەوانیش:

(١) **باوەڕداران**. چونکە خوای پەروەردگار لە ئایەتەکەدا دەفەرمووێت: ﴿وَيَسْتَغْفِرُونَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا﴾ زانای پایە بەرز شێخ (ناصر السَّعْدِي) لە تەفسیرەکەیدا ووتوویەتی: ئەمە سودو بەرووبومی باوەڕو ئیمانە، چونکە ئەو مەلائیکەتانەی ئیمان و باوەڕی زۆر بەهێزو دامەزراویان بە خوای گەورە هێناوەو هیچ تاوان و گوناهێکیان نییە بۆ ئەهلی ئیمان و باوەڕداران دەپاڕێنەوەو دوای لێخۆش بوونیان بۆ دەکەن لای خوای گەورە، کەواتە باوەڕدار بەهۆی باوەڕهێنانیەوە ئەم فەزڵ و شانازییە بە دەست دەهێنێت[٥٨].

---

[٥٧] بڕوانە: تفسير السعدي (٨٠٠) .

[٥٨] بڕوانە: تفسير السعدي (٨٠٠) .

(٢) **تەوبەکاران**. چونکە خوای پـەروەردگار دەفـەرمووێت: ﴿فَٱغۡفِرۡ لِلَّذِينَ تَابُواْ﴾، ئەوانەی کە لە هاوبەش بڕیاردان‌و گوناه و تـاوان تـەو بە دەکەن [٥٩].

(٣) **شوێن کەوتووی بەرنامەو ڕێبازی خوا**. چـونکە خـوای پـەروەردگار دەفـەرمووێت: ﴿وَٱتَّبَعُواْ سَبِيلَكَ﴾ واتـە: فریـشتەکان دەڵێنـک ئـەی پەروەردگار لەو کەسانە خۆش بە کە بەڕاستی شوێنی ئایینی ئیسلام کەوتوون [٦٠].

**سێیەم**: ئەو مەلائیکەتانە داوای پێنج شتیان لە خـوای پـەروەردگار کردووە بۆ باوەڕداران، ئەوانیش:

(١) **لێخۆش بوونی تاوان**. چـونکە خـوای پـەروەردگار دەفـەرمووێت: ﴿وَيَسۡتَغۡفِرُونَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ واتـــە: داوای لێخۆشـــبوون دەکـــەن بـــۆ ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە، هەروەها دەفـەرمووێت: ﴿فَٱغۡفِرۡ لِلَّذِينَ تَابُواْ وَٱتَّبَعُواْ سَبِيلَكَ﴾ ئەی پەروەردگار خۆشببە لەوانەی کە تەوبەیان کردووەو لە گوناهەکانیان پەشیمانن.

---

[٥٩] بڕوانە: تفسير القرطبي (١٤/٢٩٥) وتفسير السعدي (٨٠١) .

[٦٠] بڕوانە: تفسير القرطبي (١٥/٢٩٥) وتفسير البغوي (٤/٩٣) وزاد المسير (٧/٢٠٩) .

(٢) **پاراستن لە ئاگری دۆزەخ**. چونکە خوای پەروەردگار دەفەرموویّت: ﴿وَقِهِمۡ عَذَابَ ٱلۡجَحِيمِ﴾ واتە: وە لە ئاگری دۆزەخیش بیان پارێزە.

(٣) **خستنە ناو باخ و باخاتی بەهەشتی بەڵێن پێدراو لە گەڵ باوك و دایك و هاوسەران و نەوەکانیان**. چونکە خوای پەروەردگار دەفەرموویّت: ﴿رَبَّنَا وَأَدۡخِلۡهُمۡ جَنَّٰتِ عَدۡنٍ ٱلَّتِي وَعَدتَّهُمۡ وَمَن صَلَحَ مِنۡ ءَابَآئِهِمۡ وَأَزۡوَٰجِهِمۡ وَذُرِّيَّٰتِهِمۡۚ﴾ واتە: پەروەردگارا بیان خەرە ئەو باخ و باخاتەی بەهەشتەوە کە بەڵێنت پێداون، وە لە گەڵ باوك و دایك و هاوسەران و نەوەکانیان .

(٤) **پاراستنیان لە تۆڵەی هەموو گوناهەکان**. چونکە خوای پەروەردگار دەفەرموویّت: ﴿وَقِهِمُ ٱلسَّيِّـَٔاتِ﴾ واتە: پەروەردگارا لە تۆڵەی هەموو گوناهەکان بیان پارێزە [٦١].

**چوارەم: ووتەی سەلەفی ئەم ئوممەتە سەبارەت بەم ئایەتەو دوعاو پاڕانەوەی مەلائیکەتەکان .**

یَحیی کوڕی مُعَاذ بە دۆست و هاوەڵەکانی دەفەرموو: لە مانای ئەم ئایەتە تێبگەن و بیری لێ بکەنەوە، چونکە بەڕاستی ئەگەر مەلائیکەتێك لە خوای گەورە بپاڕێتەوە تا لە باوەڕداران خۆش ببێت،

(٦١) بروانە: تفسیر ابن کثیر (٤/٧٦) وفتح القدیر (٤/٦٨٧) و تفسیر السعدي (٨٠١) .

ئەوا خوای گەورە لێیان خۆش دەبێت، چجای هەموو مەلائیکەتـەکان و هەڵگرانی عەرشی خوای گەورە بۆت بپاڕێنەوە [٦٢].

خَلَف کـوڕی هِشَام دەڵێـت: قورئـانم بەسـەر (سُلَیْم کـوڕی عِیسی) خوێنـد، کاتێـك گەیـشتمە ﴿وَيَسْتَغْفِرُونَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا﴾ دەسـتی کـرد بەگریان، پاشان فەرمووی: ئەی خەلـەف! بـاوەڕدار چـەندە بـەڕێزە لـەلای خـوای گـەورە، لەسـەر جێگاکـەی خـەوتووەو مەلائیکەتـەکان داوای لێخۆش بوونی بۆ دەکەن [٦٣].

مُطَرِّفِ کوڕی الشِّخِّير) ووتوویەتی: زانیومانە و بۆمان ڕوون بووەتەوە کـە دڵـسۆزترین دروسـتکراو لـە دروسـتکراوەکانی خـوای گـەورە مەلائیکەتـــەکانن، وە ناپـــاکترین و فێڵبـــازترین دروســـتکراو لـــە دروستکراوەکانی خوای گەورەدا شەیتانەکانن، پاشـان ئـەو ئایەتـەی سورەتی (غافر)ی خوێندەوە [٦٤].

---

[٦٢] بڕوانە: تفسير القرطبي (١٥/٢٩٥) .

[٦٣] بڕوانە: تفسير القرطبي (١٥/٢٩٥) .

[٦٤] بڕوانە: تفسير القرطبي (١٥/٢٩٥) و تفسير البغوي (٤/٩٣) وتفسير ابن كثير (٤/٧٦) .

## هەژدەیەم: دوعاو پاڕانەوەی مەلائیکەتەکان بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ)

بێگومان پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەختەوەرترین بەندەی خوای پەروەردگارە، وە بەرزترینیانە لە پلەو پایەدا وە خێرترینیان، وە مەلائیکەتەکان دوعای بۆ دەکەن و داوای پلەو پایەی بەرزی بۆ دەکەن لای پەروەردگار، هەروەك خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّۚ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ صَلُّواْ ﴿٥٦﴾ ﴾ الأحزاب

واتە: بەڕاستی خوای گەورە ڕەحم و بەزەیی خۆی دەڕێژێت بەسەر پێغەمبەری خوادا (ﷺ) وە مەلائیکەتەکان داوای پلەو پایەی بەرزی بۆ دەکەن لای خوای گەورە، ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە ئێوەش سەلاوات و سەلامی لەسەر بدەن .

ئیمامی (إِبْنُ كَثِير) لە تەفسیرەکەیدا ووتوویەتی: مەبەست لەم ئایەتەدا ئەوەیە کە خوای گەورە بۆ بەندەکانی ڕوونکردۆتەوەو هەواڵی پێداون بەوەی کە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) پلەو پایەی زۆر بەرزو بێ سنوری هەیە، بۆیە لەلای مەلائیکەتە نزیکەکانی مەدحی دەکات، وە مەلائیکەتەکانیش داوای پلەو پایەی بەرزو بێ سنوری بۆ دەکەن، پاشان خوای گەورە فەرمان بەهەموو موسڵمانان دەکات بەوەی کە صەڵاواتی لەسەر بدەن [٦٥]

---

[٦٥] بڕوانە: تفسير ابن كثير (٣/٥٥٧) تفسير السعدي (٧٣١) .

**چەند ڕوونکردنەوە**

**یەکەم:** لەسەرەتای ئایەتەکەدا خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ ﴾ وە ئەمەش (جُمْلَة اِسْمِيَّة) بۆ بەردەوامی دەبێت، هەروەها ئایەتی﴿ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّ ﴾ (جُمْلَة فِعْلِيَّة) بۆ تازەکردنەوەو نوێ بوونەوە دەبێت (واتە: هەر کاتێك صەلاواتتان لەسەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) دا، ئەوە دەست هەڵمەگرن لەسەر صەلاواتدان، بەڵکو هەموو کاتێك دووبارەی بکەنەوە و بیڵێنەوە [٦٦].

**دووەم:** ئەم ئایەتە بە ئامرازی دڵنیایی دەستی پێکردووە کە ئەویش (إِنَّ) وە سودەکەشی ئەوەیە بۆ گرنگی هەواڵ و باسەکەیە، وە هیچ گومانێك لەوەدا نییە کە فەرمایشتەکانی خوای پەروەردگار هەمووی حەق و ڕاستن ئەگەرچی بە ئامرازی دڵنیایش دەستی پێ نەکردبێت یان تێیدا نەبێت، چجای کە تێیدا بێت [٦٧].

**سێیەم:** وەصفی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە(ٱلنَّبِيِّ) لە جیاتی (مُحَمَّد) ئەمیش بەڵگەیە لەسەر پایە بەرزی پێغەمبەری خوا(ﷺ) [٦٨].

---

[٦٦] بڕوانە: روح المعاني (٢٢/٧٥) .

[٦٧] بڕوانە: روح المعاني (٢٢/٧٦) .

[٦٨] بڕوانە: روح المعاني (٢٢/٧٦) .

**چــوارەم:** مەلائیکەتــەکان دراونەتــە پــاڵ خــوای گــەورە لــە کــاتی صەڵاواتدانیاندا لەسەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەویش بۆ (الإِسْتِغْرَاق) واتە: هەموویان، هەروەك خوای گەورە دەفەرموویێت: (وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ) نەیفــەرمووە: (الْمَلائِكَةُ) لەگــەڵ ئــەوەی کــە هــەموو مەلائیکەتــەکان بەڕێزو گەورەو پایە بەرزو شکۆ مەندن، ئەوەش ئەوە دەگەیەنێت کە هەرچی بەڕێزو شکۆ مەندو گەورەو پیرۆز بێـت، ئـەوە دەدرێتـە پـاڵ خوای پەروەردگاری گەورەو باڵا دەست [٦٩].

**پێنجەم:** پایە بەرزی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بـەوەی کـە هـەموو ئـەو مەلائیکەتانــە صــەڵاواتی لەســەر ئــەدەن، وە ئــەمیش هــیچ کەســێك ناتوانێت ژمـارەی ئـەو صـەڵاواتانە بـژمێرێت جگـە لـە خـوای گـەورە، ئەمەش گەورەترین پایەو ڕێزە بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) [٧٠].

**سوپاس بۆ خوای پەروەردگار کە یارمەتی دام ئەم باسەیانم وەرگێراو تەواو بووم و کۆتای هات بەبەشی یەکەم .**

---

[٦٩] بڕوانە: روح المعاني (٢٢/٧٦) .

[٧٠] بڕوانە: روح المعاني (٢٢/٧٦) .

## باسی دووەم: کێن ئەوانەی مەلائیکەت نەفەرەتیان لێ دەکات

کەسانێك هەن بەد بەختو خراپەکارن مەلائیکەتەکان نەفرەتیان لێ دەکەن و دوعای خراپیان لێ دەکەن، وە دوورن لە ڕەحم و بەزەیی خوای گەورە، ئەوانیش ئەمانەن:

(١) هەرکەسێك جوێن بەهاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بدات.

(٢) هەرکەسێك لە مەدینە تاوان و بیدعە ئەنجام بدات.

(٣) هەرکەسێك خەڵکی مەدینە بترسێنێتو ستەمیان لێ بکات.

(٤) هەرکەسێك ناوو ڕەچەڵەکی خۆی بداتە پاڵ جگە لە باوکی.

(٥) هەرکەسێك پەیمان و بەڵێن بشکێنێت.

(٦) هەرکەسێك لە خێرو بەخشینی ماڵیدا چروك و ڕەزیل بێت.

(٧) ئەو سێ جۆرە کەسەی کە جبریل دوعای لێکردوون .

(٨) هەرکەسێك بە چەك یان بە ئاسن ئاماژە بۆ موسڵمانێك بکات.

(٩) هەرکەسێك ببێتە بەربەست لە نێوان خاوەنی کوژراوێك و تۆڵەسەندنەوەی بکوژێکدا.

(١٠) ئەو ئافرەتانەی جێگای پیاوەکەی جێدەهێڵێت.

(١١) هەرکەسێك بێ باوەڕبێت و بەوشێوەیەش بمرێت.

(١٢) هەرکەسێك لە پاش باوەڕهێنان بێ باوەڕبێتەوە .

**بە پشتیوانی خوای پەروەردگار باسی هەموو ئەمانە دەکەین بە بەڵگەوە .**

## یەکەم: هەرکەسێك جوێن بە هاوەڵەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)

یەکێك لەوانەی کە مەلائیکەتەکان نەفرەتی لێ دەکەن و دوعای لێ دەکەن، ئەوانەن کە جوێن بە هاوەڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ) دەدەن.
ئیمامی (الطَّبَرَانِي) گێڕاویەتیەوە لە اِبنُ عَبَّاس‌ەوە (خوایان لێ ڕازی بێت) کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((مَنْ سَبَّ أَصْحَابِي فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلائِكَةِ، وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ)) [٧١].

واتە: هەرکەسێك جوێن بە هاوەڵانم بدات ئەوە نەفرەتی خواو مەلائیکەتەکان و هەموو خەڵکی لەسەر بێت. وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگری کردووە لەوەی کە جوێن بە هاوەڵەکانی بدرێت.
ئیمامی (بُخَارِي ومُسْلِم) گێڕاویانەتەوە لە أَبُو سَعِيد الْخُدْرِي (خوای لێ ڕازی بێت) کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((لاَ تَسُبُّوا أَصْحَابِي ، فَلَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ أَنْفَقَ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا مَا بَلَغَ مُدَّ أَحَدِهِمْ وَلاَ نَصِيفَهُ)) [٧٢] واتە: جوێن بە هاوەڵەکانم مەدەن، چونکە بەڕاستی ئەگەر یەکێك لە ئێوە بە ئەندازەی کێوی ئوحود زێڕ ببەخشێت ئەوا هێشتا ناگات بە مشتێکی ئەوان، بەڵکو ناگات بە نیو مشتیشیان.

---

[٧١] بڕوانە: رواه الطبراني وصححه الشيخ الألباني في الصحيحة (٢٣٤٠) وفي صحيح الجامع (٦٢٨٥).
[٧٢] رواه البخاري (٣٦٧٣) ومسلم (٦٦٥١) .

## دووەم: هەرکەسێك لە مەدینە تاوان و بیدعە ئەنجام بدات

یەکێکی تر لەو کەسانەی کە بەدبەخت و چارە ڕەشن و مەلائیکەتەکان نەفرەتی لێ دەکەن و دوعای لێ دەکەن، ئەوانەن کە لە شاری مەدینەدا تاوان ئەنجام دەدەن یان شتی داهێنراو زیاد دەکەن کە لەدیندا نییە.

ئیمامی (بُخَاري) گێڕاویەتیەوە لە ئیمامی عَليّ (خوای لێ ڕازی بێت) کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((الْمَدِينَةُ حَرَامٌ، مَا بَيْنَ عَائِرٍ إِلَى ثَوْرٍ، فَمَنْ أَحْدَثَ حَدَثًا، أَوْ آوَى مُحْدِثًا، فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلاَئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ، لاَ يُقْبَلُ مِنْهُ عَدْلٌ وَلاَ صَرْفٌ)) [٧٣].

واتە: شاری مەدینە حەرامە تاوان و بیدعەی تێدا ئەنجام بدرێت لە نێوان شاخی عیر تاکو شاخی ثور، بۆیە هەرکەسێك تاوان یان بیدعەی تێدا ئەنجام بدات، وە یان پەنای تاوانبار یاخود بیدعەچی تێدا بدات، ئەوە نەفرەتی خوای گەورەو مەلائیکەتەکان و هەموو خەڵکی لێ بێت، وەخوای گەورە نە تۆبەو نە چاکەو نەهیچ بەرامبەری لێ وەرناگرێت (خوای پەروەردگار نە عیبادەتی فەرزو نە عیبادەتی سوننەتی لێ وەرناگرێت).

---

[٧٣] رواه البخاري (٣١٧٩) ومسلم (٤٦٩) .

## سێیەم: هەرکەسێك خەڵکی مەدینە بترسێنێت یان ستەمیان لێ بکات

یەکێکی تر لەو کەسانەی کە مەلائیکەتەکان نەفرەتی لێ دەکەن‌و دوعای لێ دەکەن، ئەوانەن کە خەڵکی مەدینە دەترسێنن یان زوڵم‌و ستەمیان لێ دەکەن.

ئیمامی الطَّبَرَانِي) گێڕاویەتیەوە لە عُبَادَة کوڕی صامِت (خوای لێ ڕازی بێت) کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((اللَّهُمَّ مَنْ ظَلَمَ أَهْلَ الْمَدِينَةِ وَأَخَافَهُمْ، فَأَخِفْهُمْ، وَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ، وَالْمَلائِكَةِ، وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ، لا يَقْبَلُ اللَّهُ مِنْهُ صَرْفًا وَلا عَدْلا )) [٧٤].

واتە: پەروەردگارا هەرکەسێك زوڵم‌و ستەم لە خەڵکی مەدینە دەکات یان ئەیان ترسێنێت، ئەوا تۆش ئەوانە بترسێنیت، وە نەفرەتی خوای گەورەو مەلائیکەتەکان‌و هەموو خەڵکی لێ بێت، وەخوای گەورە نە تۆبەو نە چاکەو نەهیچ بەرامبەری لێ وەرناگرێت، (خوای پەروەردگار نە عیبادەتی فەرزو نە عیبادەتی سوننەتی لێ وەرناگرێت).

ئیمامی أحمَد گێڕاویەتیەوە لە جَابِرەوە (خوای لێ ڕازی بێت) کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((مَنْ أَخَافَ أَهْلَ الْمَدِينَةِ أَخَافَهُ

---

[٧٤] رواه الطبراني وصححه الشيخ الألباني في الصحيحة(٢٦٧١) وفي صحيح الترغيب والترهيب(١٢١٤).

اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ وَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلاَئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ لاَ يَقْبَلُ اللَّهُ مِنْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ صَرْفاً وَلاَ عَدْلاً)) [٧٥]

واتــە: هەرکەسـێك خــەڵکی مەدینــە بترسـێنێت، ئــەوە خــوای گـــەورە دەی ترســـێنێت، وە نـــەفرەتی خـــوای گـــەورەو مەلائیکەتــەکان و هــەموو خــەڵکی لێ بێــت، وەخــوای گــەورە لــە ڕۆژی دواییـــدا نـــە تۆبـــەو نـــە چـــاکەو نـــەهیچ بەرامبـــەری لێ وەرناگرێت.

---

[٧٥] رواه احمد (١٢٧٠٩) وصححه الشيخ الالباني في السلسلة الصحيحة (٢٣٠٤)

**چوارەم: هەرکەسێك ناوو ڕەچەڵەکی خۆی بداتە پاڵ جگە لە باوکی**

یەکێکی تر لەو کەسانەی کە مەلائیکەتەکان نەفرەتی لێ دەکەن‌و دوعای لێ دەکەن، ئەو کەسەیە کە نەژادو ڕەچەڵکی خۆی بداتە پاڵ جگە لە باوکی.

ئیمامی مُسْلِم گێڕاویەتیەوە لە ئیمامی عَلِيٍ‌وە (خوای لێ ڕازی بێت) کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((وَمَنِ ادَّعَى إِلَى غَيْرِ أَبِيهِ أَوِ انْتَمَى إِلَى غَيْرِ مَوَالِيهِ فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلاَئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ لاَ يَقْبَلُ اللَّهُ مِنْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ صَرْفًا وَلاَ عَدْلاً)) [٧٦].

واتە: هەرکەسێك ناوو نەژادو ڕەچەڵەکی خۆی دایە پاڵ جگە لە باوکی، یان خۆی خستە پاڵ کەسانێکی جگە لە خاوەنەکانی خۆی، ئەوە نەفرەتی خوای گەورەو مەلائیکەتەکان‌و هەموو خەڵکی لێ بێت، وەخوای گەورە لە ڕۆژی دواییدا نەتۆبەو نە چاکەو هیچ بەرامبەری لێ وەرناگرێت.

هەروەها پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە فەرمودەیەکی تردا فەرموویەتی: (مَنِ ادَّعَى إِلَى غَيْرِ أَبِيهِ، وَهْوَ يَعْلَمُ أَنَّهُ غَيْرُ أَبِيهِ، فَالْجَنَّةُ عَلَيْهِ حَرَامٌ)[٧٧]

واتە: هەرکەسێك ناوو نەژادو ڕەچەڵەکی خۆی دایە پاڵ

---

[٧٦] رواه مسلم (٣٣٩٣) .

[٧٧] رواه البخاري (٤٣٢٦) ومسلم (٢٢٩) .

جگە لە باوکی خۆی، وە خۆشی باش دەزانێت کە ئەوە باوکی ڕاستەقینەی خۆی نیە، ئەوا ئەو کەسە بەهەشتی لەسەر حەرام کراوە .

## پێنجەم: هەرکەسێك پەیمان و بەڵێن بدات و پاشان بیشکێنێت

یەکێکی تر لەو کەسانەی کە بەدبەختو چارە ڕەشنو مەلائیکەتەکان نەفرەتی لێ دەکەنو دوعای لێ دەکەن، ئەوانەن کە پەیمانو بەڵێن دەدەنو پاشان دەی شکێنن.

ئیمامی بُخَاري گێڕاویەتیەوە لە ئیمامی عَلي‌وە (خوای لێ ڕازی بێت) کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((وَذِمَّةُ الْمُسْلِمِينَ وَاحِدَةٌ، يَسْعَى بِهَا أَدْنَاهُمْ، فَمَنْ أَخْفَرَ مُسْلِمًا فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلاَئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ، لاَ يُقْبَلُ مِنْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ صَرْفٌ وَلاَعَدْلٌ ))[٧٨].

واتە: پەیمان و بەڵێنی موسڵمانان یەکەو جیاوازی تێدانییە، دەبێت موسڵمانان هەموویان پابەندی بن، جا هەرکەسێك پەیمان و بەڵێن بشکێنێت، ئەوە نەفرەتی خوای گەورە و مەلائیکەتەکانو هەموو خەڵکی لێ بێت، وەخوای گەورە لە ڕۆژی دواییدا نەتۆبەو نە چاکەو هیچ بەرامبەری لێ وەرناگرێت.

---

[٧٨] رواه البخاري (٦٧٥٥) ومسلم (٣٣٩٧) .

## شەشەم: هەرکەسێك لە خێرو بەخشینی ماڵیدا چروكو ڕەزیل بێت

یـەکێکی تـر لـەو کەسـانەی کـە بەدبـەختو چـارە ڕەشـنو مەلائیکەتـەکان نـەفرەتی لـێ دەکـەن و دوعـای لێ دەکـەن، ئەوانەن کە لە خێرو بەخشینی ماڵیاندا چروك و ڕەزیلن.

ئیمامی بُخَارِي و مُسْلِم گێڕاویانەتەوە لە أَبُو هُرَيْرةوە (خوای لێ ڕازی بێت) کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((مَا مِنْ يَوْمٍ يُصْبِحُ الْعِبَادُ فِيهِ إِلاَّ مَلَكَانِ يَنْزِلاَنِ فَيَقُولُ أَحَدُهُمَا اللَّهُمَّ أَعْطِ مُنْفِقًا خَلَفًا، وَيَقُولُ الآخَرُ اللَّهُمَّ أَعْطِ مُمْسِكًا تَلَفًا)) [٧٩].

واتـە: هـیچ ڕۆژێ نییـە کـە بەنـدەکان ڕۆژیـان لـێ دەبێتـەوە، دوو مەلائیکەت دێنە خوارەوە، یەکێکیان دەفەرمووێ: خوادیـە ببەخـشە بەو کەسەی کە دەبەخشێت لەبەر خاتری تۆ وە جێگای ئەوەشی بۆ پـڕ بکـەرەوە کەبەخـشیوێتی، ئـەوەی تریـان دەڵێـت: ئـەی خوایـە ئەوکەسەی دەسـتی گرتۆتـەوەو نابەخـشێت و چـروکە ماڵەکـەی لـێ بگرەوەو لەناوی بەرە.

ئیمامی أَحمَد گێڕاویەتیەوە لە أَبُو الدَّرْدَاءِەوە (خوای لێ ڕازی بێت) کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((مَا طَلَعَتْ شَمْسٌ قَطُّ إِلاَّ بُعِثَ

---

[٧٩] رواه البخاري كتاب الزكاة(١١٤٢) ومسلم كتاب الزكاة (١٠١٠) .

بِجَنْبَتَيْهَا مَلَكَانِ يُنَادِيَانِ يُسْمِعَانِ أَهْلَ الأَرْضِ إِلاَّ الثَّقَلَيْنِ يَا أَيُّهَا النَّاسُ! هَلُمُّوا إِلَى رَبِّكُمْ فَإِنَّ مَا قَلَّ وَكَفَى خَيْرٌ مِمَّا كَثُرَ وَأَلْهَى، وَلاَ آبَتْ شَمْسٌ قَطُّ إِلاَّ بُعِثَ بِجَنْبَتَيْهَا مَلَكَانِ يُنَادِيَانِ يُسْمِعَانِ أَهْلَ الأَرْضِ إِلاَّ الثَّقَلَيْنِ اللَّهُمَّ أَعْطِ مُنْفِقاً خَلَفاً وَأَعْطِ مُمْسِكاً مَالاً تَلَفاً)) [٨٠].

واتە: هیچ ڕۆژێ نیە کە خۆری تێدا هەڵ هاتبێ ئیللا لە تەنیشتیدا دوو مەلائیکەت نێردراوەو بانگ دەکەن، جا هەرچی لەسەر زەوییە گوێیان لەو بانگە دەبێت، جگە لە مرۆڤ و جن، دەفەرموون: ئەی خەڵکینە! وەرن بۆلای پەروەردگارتان، چونکە بەڕاستی ئەو ماڵو سامانەی بێتو بەشت بکات باشترە لەوەی کە زۆر بێتو سەرقاڵو بێ ئاگات بکات لە پەرستنی خوای گەورە، وە هیچ ڕۆژێك خۆری تێدا نەگەڕاوەتەوە ئیللا لەتەنیشتیدا دوو مەلائیکەت نێردراوەو بانگ دەکەن، جا هەرچی لەسەر زەویە گوێیان لەو بانگە دەبێت جگەلە مرۆڤ و جن، دەفەرموون: خودایە ببەخشە بەو کەسەی کە دەبەخشێت وە جێگای ئەوەشی بۆ پڕ بکەرەوە کە بەخشیوێتی، وە ئەوکەسەی دەستی گرتۆتەوەو نابەخشێتو چرووکە ماڵەکەی لێ بگرەوەو لەناوی بەرە.

---

[٨٠] رواه احمد وابن حبان وصححه الشيخ الألباني في صحيح الترغيب والترهيب (١٧٠٦) .

## حەوتەم: ئەو سێ جۆرە خەڵکەی کە جبریل دوعای لێکردوون

یەکێکی تر لەوانەی کە مەلائیکەتەکان نەفرەتی لێ دەکەن و دوعای لێ دەکەن، ئەو سێ جۆرە کەسەن کە جبریل (عليه السلام) دوعای لێکردن بەوەی کە دووربن لە ڕەحم و بەزەیی خوای گەورە ئەوانیش:

(١) کەسێك بگات بە مانگی ڕەمەزان و بەبێ هیچ هۆیەك بەڕۆژوو نەبێت .

(٢) کەسێك پشت بکات لە دایك و باوکی لە کاتی بێ توانایاندا

(٣) کەسێك ناوی پێغەمبەری خوای (ﷺ)لا بهێنرێت و صەڵاواتی لەسەر نەدات.

هاوەڵی بەڕێز مَالِك کوڕی الْحُوَيْرِث (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: جارێکیان پێغەمبەر (ﷺ) سەرکەوتە سەر مینبەر لە پلەی یەکەم فەرمووی: (آمين)، وە پلەی دووەمیش وتی: (آمين)، وە لە پلەی سێیەمیش وتی: (آمين)، پاشان کە هاوەڵانی بەڕێز پرسیاریان کرد لە پێغەمبەر (ﷺ) بۆچی سێ جار وتت: (آمين)، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((أَتَانِي جِبْرِيلُ (عليه السلام)، فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ مَنْ أَدْرَكَ أَحَدَ وَالِدَيْهِ، فَمَاتَ، فَدَخَلَ النَّارَ، فَأَبْعَدَهُ اللَّهُ، قُلْ آمِينَ، فَقُلْتُ: آمِينَ، قَالَ: يَا مُحَمَّدُ مَنْ أَدْرَكَ شَهْرَ رَمَضَانَ، فَمَاتَ، فَلَمْ يُغْفَرْ لَهُ، فَأُدْخِلَ

النَّـارَ، فَأَبْعَـدَهُ اللَّـهُ، قُـلْ آمِـينَ، فَقُلْـتُ: آمِـينَ، قَـالَ: وَمَـنْ ذُكِـرْتَ عِنْـدَهُ فَلَـمْ يُـصَلِّ عَلَيْـكَ، فَمَـاتَ فَـدَخَلَ النَّـارَ، فَأَبْعَـدَهُ اللَّـهُ، قُـلْ آمِينَ، فَقُلْتُ: آمِينَ)) [٨١].

واتـە: کاتێـك ئـەم ووت: (ئـامین)، ئـەوە جبریل (عليه السلام) بـوو هـات بـۆ لام و پێـی ووتم: ئـەی مُحَمَد (ﷺ) هـەر موسـڵمانێك یـەکێك لـە دایـك و بـاوکی پـیر بـوون و کەوتنـە لای ئەوەنـدە چـاکەی لەگەڵـدا نـەکردن تـا بـە هۆیانـەوە بـچێتە بەهەشـتەوە، بـەڵکو خـراپ بـوو لەگـەڵیان، کاتێـك مـردوو چـووە ئـاگری دۆزەخـەوە، ئـەوە خـوای پـەروەردگار لـە ڕەحـم و بـەزەیی خـۆی دووری خاتـەوە، بڵـێ: (ئـامین)، منـیش ووتم: (ئـامین)، کاتێـك لـە پلـەی دووەم ووتم: (ئـامین)، جبریـل (عليه السلام) پێـی ووتم: ئـەی مُحَمَـد (ﷺ) هـەر موسـڵمانێك کاتێـك مـانگی ڕەمـەزانی پێگەیـشت ئەوەنـدە چـاکەی تیـا نـەکرد تـا بـە هۆیـەوە بـچێتە بەهەشـتەوە، بـەڵکو خراپـەی تیـا دەکـرد، کاتێـك مـردوو چـووە ئـاگری دۆزەخـەوە، ئـەوە خـوای پـەروەردگار لـە ڕەحـم و بـەزەیی خـۆی دووری خاتـەوە، بڵـێ: (ئـامین)، منـیش ووتم: (ئـامین)، کاتێـك لـە پلـەی سـێیەم ووتم:

---

[٨١] رواه ابن حبان(٤٠٩) والحاكم(٤٤٥) وصححه الشيخ الألباني في صحيح الترغيب والترهيب(٩٩٦).

(ئـــامین)، جبریـل (العَلَيْهِ) پێـــی ووتم: ئـــەی مُحَمَّـد (ﷺ) هـــەر موسـڵمانێك کاتێـك نـاوی لای هێنـراو بیـستی، بـەلاّم سـەلاّواتی لەسـەرت نـەدا، تـا بـە هۆیـەوە بـچێتە بەهەشـتەوە، بـەڵکو گـوێی پێنـەداو پـشت گـوێی خـست و بـە کـەمی زانـی، کاتێـك مـردوو چـووە ئـاگری دۆزەخـەوە، ئـەوە خـوای پـەروەردگار لـە ڕەحـم و بـەزەیی خـۆی دووری خاتـەوە، بلّـێ: (ئـــامین)، منـــیش ووتم: (ئامین).

**ئیمامی (الطِيبِي) فەرموویەتی: هۆکاری دوعا کـردن لـەو سـێ جـۆر کەسـە ئەوەیە کە:**

(١) صەلاّواتدان لەسەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) واتای ڕێز لێنان و حورمەت گرتنو خۆش ویستنێتی، جا هەرکەسێك پێغەمبەری خـوای (ﷺ) خـۆش بوێت و ڕێزی لێ بگرێت، ئەوا خوای گەورە ڕێزو حورمەت بـۆ ئـەو کەسـە دادەنێـت، وە هەرکەسـێکیش ڕێـزو حورمـەتو خۆشەویـستی نـەبێت بـۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئـەوا خـوای گـەورە سـوك و ڕسـواو سـەر شـۆڕی دەکات.

(٢) وە مانگی ڕەمەزان مانگێکی گەورەو پیرۆزە لەلای خوای گەورە، ﴿ شَهۡرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلۡقُرۡءَانُ هُدٗى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَٰتٖ مِّنَ ٱلۡهُدَىٰ وَٱلۡفُرۡقَانِۚ ﴾ (البقرة: ١٨٥).

**واتە:** مانگی ڕەمەزان مانگێکە قورئانی تێدا نێردراوەتە خـوارەوە، بۆئەوەی ببێتە ڕێنیشاندەری خەڵکی، وە چـەندەها بەڵگـەی ڕۆشـنی

تێدایە بۆ ڕێنموونییو جیاکردنەوەی ڕەواو نا ڕەوا . ئنجا هەرکەسێك بە بیرو باوەڕێکی بتەوو بەهێزەوە لەرەمەزاندا بەڕۆژوو ببێتو چاوەڕوانی پاداشتەکەی لە خوای گەورە بکات، ئەوا خوای گەورە لە تاوانەکانی پێشووی خۆش دەبێت، وە هەرکەسێکیش بەگەورەی نەزانێتو ڕێزی لەو مانگە پیرۆزە نەگرێت، ئەوا خوای گەورە ڕسواو سەر شۆڕی دەکات.

(٣) هەروەها ڕێز گرتن لە دایك و باوك و باش بوون لەگەڵیاندا فەرمانی خوای گەورەیە، ﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَـٰنًا﴾ (الإسراء: ٢٣).

واتە: پەروەردگارت بڕیاری داوەو فەرمانی کردووە کە هیچ شتێك نەپەرستن جگە لەو، وە لەگەڵ دایكو باوکتاندا چاك بن، بۆیە هەرکەسێك ڕێز لە دایكو باوکی نەگرێتو چاك نەبێت لەگەڵیاندا، ئەوا خوای گەورە ڕسواو سەر شۆڕی دەکات .

## هەشتەم: هەرکەسێك بە چەك یان بە ئاسن ئاماژە بۆ موسڵمانێك بكات

یەکێکی تر لەو کەسانەی کە بەدبەختو چارە ڕەشن‌و مەلائیکەتەکان نەفرەتی لێ دەکەن‌و دوعای لێ دەکەن، ئەوانەن کە ڕووی چەك یان ئاسن‌و چەقۆ لەبرای موسڵمانیان دەکەن.

ئیمامی مُسْلِم گێڕاویەتیەوە لە أَبُو هُرَيرةوە (خوای لێ ڕازی بێت) کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((مَنْ أَشَارَ إِلَى أَخِيهِ بِحَدِيدَةٍ فَإِنَّ الْمَلاَئِكَةَ تَلْعَنُهُ حَتَّى وَإِنْ كَانَ أَخَاهُ لأَبِيهِ وَأُمِّهِ)) [٨٢].

واتە: هەرکەسێك ئاماژە بۆ برای موسڵمانی بکات بە ئاسن، ئەوا مەلائیکەتەکان نەفرەتی لێ دەکەن، ئەگەر چی ئەو موسڵمانەی کە دەیترسێنێت برای باوك و دایکی خۆشی بێت.

ئیمامی (النَّوَوِيّ) لەشەرحی ئەم فەرموودەیەدا فەرموویەتی: ڕێگریی و قەدەغە و ترسێکی زۆر توندی تێدایە بۆئەوانەی کە ئازار بەبرای موسڵمانیان دەگەیێنن، وە هەروەها ڕێگری و قەدەغەیەو گشتیەو بۆ هەموو کەسێکە، جا ئەو کەسە تاوانبار بێت یان تاوان بار نەبێت، وە بۆ گاڵتەو سوعبەت بێت یان بۆ یاریکردن‌و خۆشی بێت، ئەوا نەفرەتی مەلائیکەتەکان بەڵگەیە بۆ حەرامیی ئەو کارە [٨٣].

---

[٨٢] رواه مسلم، باب النهي عن الإشارة بالسلاح إلى مسلم (٦٨٣٢) .

[٨٣] بڕوانە: شرح النووي على صحيح مسلم (٤٤٨/٨) .

**وە هۆکاری ئەم حەرام و ڕێگریی و قەدەغەیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕوونی کردۆتەوە ئەویش:**

ئیمامی بُخَاري گێڕاویەتیەوە لە أَبُو هُرَيرَةوە (خوای لێ ڕازی بێت) کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((لاَ يُشِيرُ أَحَدُكُمْ عَلَى أَخِيهِ بِالسِّلاَحِ، فَإِنَّهُ لاَ يَدْرِي لَعَلَّ الشَّيْطَانَ يَنْزِعُ فِي يَدِهِ، فَيَقَعُ فِي حُفْرَةٍ مِنَ النَّارِ)) [٨٤] واتە: با هیچ کەسێك لە ئێوە ڕووی چەکەکەی نەکات لە برای موسڵمانی، چونکە ئەو نازانێت لەوانەیە شەیتان لە دەستی دەرکات‌و بیخاتە ناو دۆڵێك لە ئاگرەوە .

**دوو ڕوونکردنەوە لەم باسەدا:**

**یەکەم:** بێگومان ئەم ڕێگریی‌و قەدەغەیەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ بەربەست‌و نەهێشتنی بڵاو بوونەوەی خراپەکاری‌و تاوانە، وە ئاینی پیرۆزی ئیسلام هەموو ئەو شتانەی قەدەغەکردووە کە سەر دەکێشن بۆ قەدەغەو حەرام .

**دووەم:** ئەگەر ڕووتێکردن و ئاماژی چەك‌و چەقۆو شمشێر بۆ یاریکردن و گاڵتە و سوعبەت بێت، ئەوە نەفرەتی مەلائیکەتەکانی بۆ واجب دەبێت، ئەی ئەگەر کەسێك موسڵمانێك ئازار بدات یان بریندداری بکات یان بکوژێت؟ ئەبێت سزاکەی چۆن بێت؟!

---

[٨٤] رواه البخاري (٧٠٧٢) ومسلم (٦٨٣٤) .

## نۆیەم: هەرکەسێك ببێتە بەربەست لە نێوان خاوەنی کوژراوێك‌و تۆڵەسەندنەوەی بکوژێکدا

ئیمامی أَبُو دَاوُدَ گێڕاویەتیەوە لە اِبْنُ عَبَّاس‌ەوە (خوایان لێ ڕازی بێت) کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((مَنْ قُتِلَ فِي عِمِّيَا أَوْ رِمِّيَا تَكُونُ بَيْنَهُمْ بِحَجَرٍ أَوْ سَوْطٍ أَوْ بِعَصًا، فَعَقْلُهُ عَقْلُ خَطَإٍ، وَمَنْ قَتَلَ عَمْدًا فَقَوَدُ يَدِهِ فَمَنْ حَالَ بَيْنَهُ وَبَيْنَهُ فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلاَئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ لاَ يُقْبَلُ مِنْهُ صَرْفٌ وَلاَعَدْلٌ )) [٨٥].

واتە: هەرکەسێك بە گەڕە لاوژێ یان لە ڕەمی کردن لە نێوان خۆیاندا کەسێك بکوژێت، جا بە بەرد بێت یان بە قامچی‌و دار، ئەوا بری خوێنەکەی بری خوێنی هەڵەیە، وە هەرکەسێك بەئەنقەست بکوژرێت، ئەوا تۆڵەی قصاصەکەی کوشتنەوەی بکوژەکەیە، کە تاوانەکە لەسەر دەستی ڕووی داوە، وە هەرکەسێکیش ببێتە ڕێگرو بەربەست لە نێوان خاوەنی کوژراوەکەو تۆڵەسەندنەوەی بکوژەکەدا، ئەوا نەفرەتی خوای گەورەو مەلائیکەتەکان‌و هەموو خەڵکی لێ بێت، وەخوای گەورە لە ڕۆژی دواییدا نە تۆبەو نە چاکەو هیچ بەرامبەری لێ وەرناگرێت.

---

[٨٥] رواه ابوداود وابن ماجة والنسائي وصححه الشيخ الألباني في صحيح الجامع (٦٤٥٠) .

## دەیەم: ئەو ئافرەتانەی جێگای مێردەکانییان جێدەهێڵن

یەکێکی تر لەوانەی کە مەلائیکەتەکان نەفرەتی لێ دەکەن، ئەو ئافرەتانەن کە جێگای مێردەکانیان جێ دەهێڵن‌و سەرجێیان لەگەڵدا ناکەن.

ئیمامی بُخَاري گێڕاویەتیەوە لە أَبُو هُرَيرَةوە (خوای لێ ڕازی بێت) کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: ((إِذَا دَعَا الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ إِلَى فِرَاشِهِ فَأَبَتْ أَنْ تَجِيءَ لَعَنَتْهَا الْمَلاَئِكَةُ حَتَّى تُصْبِحَ))[٨٦] واتە: ئەگەر پیاو خێزانەکەی خۆی بانگ کرد بۆ سەرجێی‌و جیماع کردن‌و خێزانەکەشی نەیات بۆلای، وە پیاوەکەش ئەوشەوە بە تووڕەیی بباتە سەر، ئەوە مەلائیکەتەکان نەفرەتی لێ دەکەن تاکو ڕۆژ دەبێتەوە.

هەروەها فەرموودەیەکی ترمان بۆ دەگێڕێتەوە لە أَبُو هُرَيرَةوە (خوای لێ ڕازی بێت) کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((إِذَا بَاتَتِ الْمَرْأَةُ مُهَاجِرَةً فِرَاشَ زَوْجِهَا لَعَنَتْهَا الْمَلاَئِكَةُ حَتَّى تَرْجِعَ)) [٨٧].

واتە: ئەگەر ئافرەتێك بە بێزاری‌و بەبێ هیچ هۆیەك جێی مێردەکەی بەجێهێشت، وە دوور لە مێردەکەی ڕۆژ بکاتەوە، ئەوا مەلائیکەتەکان نەفرەتی لێ دەکەن تاکو دەگەڕێتەوە.

---

[٨٦] رواه البخاري (٥١٩٣) ومسلم (٣٦١٤) .

[٨٧] رواه البخاري (٥١٩٤) ومسلم (٣٦١١) .

## یانزەیەم: هەرکەسێك بێ باوەڕبێت و بەوشێوەیەش بمرێت

یەکێکی تر لەو کەسانەی کە بەدبەخت و چارە ڕەشن و مەلائیکەتەکان نەفرەتی لێ دەکەن و دوعای لێ دەکەن، ئەوانەن کە بێ باوەڕن و بە بێ باوەڕیش دەمرن.

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَمَاتُواْ وَهُمۡ كُفَّارٌ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيۡهِمۡ لَعۡنَةُ ٱللَّهِ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلنَّاسِ أَجۡمَعِينَ ﴿١٦١﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا لَا يُخَفَّفُ عَنۡهُمُ ٱلۡعَذَابُ وَلَا هُمۡ يُنظَرُونَ ﴿١٦٢﴾﴾ (سورة البقرة).

واتە: بەڕاستی ئەوانەی بێ باوەڕ بوون و بەبێ باوەڕیش مردوون، ئەوانە لەسەریانە نەفرینی خوای گەورەو مەلائیکەتەکان تێکڕای خەڵکی، وە تێیدا دەمێننەوە بەهەمیشەیی و سزایان لەسەر سووك ناکرێتەوە، وە دوا ناخرێن لە سزاو ئەشکەنجە.

ئیمامی (إِبْنُ كَثِير) لە تەفسیرەکەیدا فەرموویەتی: خوای گەورە ڕوونی کردۆتەوە کە هەرکەسێك بێ باوەڕ بێت و لەسەر بێ باوەڕیش بمرێت، ئەوا نەفرینیان لەسەرە هەتا ڕۆژی دوایی، پاشان شوێنیان ئاگرەو بەهیچ شێوەیەك سزای ئاگریان لەسەر سوك ناکرێت تەنانەت بۆ سەعاتێکیش، بەڵکو بەهەمیشەیی سزا دەدرێن[٨٨].

---

[٨٨] بڕوانە: تفسير ابن كثير (١/٢١٤).

## دوانزەیەم: هەرکەسێك لە پاش باوەڕهێنان بێ باوەڕبێتەوە

یەکێکی تر لەو کەسانەی کە مەلائیکەتەکان نەفرەتی لێ دەکەن و دوعای لێ دەکەن، ئەوانەن کە لە پاش ئەوەی کە باوەڕ دەهێنن پاشەگەز دەبنەوەو بێ باوەڕدەبن.

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموویێت: ﴿كَيْفَ يَهْدِي اللَّهُ قَوْمًا كَفَرُوا بَعْدَ إِيمَانِهِمْ وَشَهِدُوا أَنَّ الرَّسُولَ حَقٌّ وَجَاءَهُمُ الْبَيِّنَاتُ ۚ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ ﴿٨٦﴾ أُولَٰئِكَ جَزَاؤُهُمْ أَنَّ عَلَيْهِمْ لَعْنَةَ اللَّهِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿٨٧﴾ خَالِدِينَ فِيهَا لَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ الْعَذَابُ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ ﴿٨٨﴾ إِلَّا الَّذِينَ تَابُوا مِن بَعْدِ ذَٰلِكَ وَأَصْلَحُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٨٩﴾﴾ (ال عمران:٨٦-٨٩)

واتە: چۆن خوای گەورە ڕێنموونی گەلێك دەکات بێ باوەڕ بوون دوای باوەڕهێنانیان، وە شایەتیان دابێ کە ئەو پێغەمبەرە ڕاستەو نیشانەی بۆ هاتبێ، وە خوای گەورە ڕێنموونی گەلی ستەم کار ناکات، ئەوانە سزایان ئەوەیە کە لەسەریانە نەفرینی خوای گەورەو مەلائیکەتەکانو هەموو خەڵکی، لەو نەفرینەدا دەمێننەوە بە هەمیشەیی، وە سزاو ئەشکەنجەیان لێ سوك ناکرێتو مۆڵەت نادرێن، مەگەر ئەوانەی تۆبەیان کردبێت دوای ئەوەو کردەوەی چاکیان ئەنجام دابێت، ئەوە بێگومان خوای گەورە لێ خۆشبووی میهرەبانە.

ئیمامی الطَّبَرِي لە تەفسیرەکەیدا فەرموویەتی: چۆن خوای گەورە ڕێنموونی خەڵکانێك دەکات کە ئینکاریو نکووڵی لە ڕاستێتیو حقیقەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەکەن، لە دوای ئەوەی کە بەڕاستیان داناوەو شایەتیان داوە کە نیشانەی ڕاستی بۆ هاتووە، بۆیە ئەوانە دوور دەبن لە ڕەحمی خوای گەورە، وە مەلائیکەتەکانو خەڵکیش دوعایان لێ دەکەن بە سزاو ئەشکەنجە دانیان بەهەمیشەیی لە ئاگری دۆزەخدا، وە بەهیچ شێوەیەك ئەو سزاو ئەشکەنجەیەیان لەسەر سوك ناکرێت[٨٩].

---

[٨٩] بڕوانە: تفسير الطبري (٦/٥٧٦) .

## دوو ئامۆژگاری

**یەکەم:** ئامۆژگار هەموو کەسێکی خاوەن زانستو زانیاری دەکەم، بەوەی کە ئەم کەسانە بەخەڵك بناسێنن کە مەلائیکەتەکان دوعایان بۆ دەکەنو بۆیان دەپاڕێنەوە، وە ئاگاداریشیان بکەنەوە بەوەی کە خۆیان بە دوور بگرن لەو کردەوانەی کە تووشی نەفرینی مەلائیکەتەکانیان دەکات .

**دووەم:** ئامۆژگاریم بۆ خۆم و بۆ هەموو خەڵکی بەپیاو بەئافرەتەوە، بۆ پێش برکێ و بەدەستهێنانی ئەو کارو کردەوانەی کە هۆکارن بۆ ئەوەی مەلائیکەتەکان دوعامان بۆ بکەنو بۆمان بپاڕێنەوە، وە خۆشمان بەدوور بگرین لەو کارو کردەوانەی کە هۆکارن بۆ ئەوەی کە مەلائیکەتەکان نەفرەتمان لێبکەنو دوعامان لێ بکەن.

**داواکارم لە خوای گەورەو میهرەبان تەوفیقی هەموو لایەکمان بدات.**

## ناوەرۆك

پێشەکی وەرگێڕ ........................................ (٣)

پێشەکی نوسەر ........................................ (٦)

**باسی یەکەم** ........................................ (١٤)

هەرکەسێك بە دەست نوێژەوە بخەوێت ........................(١٦)

هەرکەسێك دابنیشێت‌و چاوەڕوانی کاتی نوێژ بکات ..................(١٩)

هەرکەسێك لە ڕیزی پێشەوەی نوێژی جەماعەت بێت..............(٢٠)

هەرکەسێك لە نوێژی جەماعەتدا لە لای ڕاستی ئیمامەوە بێت..........(٢١)

هەرکەسێك ڕیزی نوێژی جەماعەت بەیەکتری بگەیەنێت.............(٢٢)

لە کاتی (آمین)ی نوێژی جەماعەت ........................(٢٣)

دانیشتن لە دوای نوێژی جەماعەت ........................(٢٥)

ئەنجامدانی نوێژی بەیانی‌و عەسر بە جەماعەت ..................(٢٩)

صەڵاواتدان لەسەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) ....................(٣١)

هەرکەسێك بۆ برایەکی موسڵمانی بپاڕێتەوە لە پاشملە ...............(٣٣)

هەرکەسێك ماڵ‌و سامان ببەخشێت لە پێناوی خوادا ..................(٣٥)

هەرکەسێك بەڕۆژوو بێت‌و پاش شێو بکات ......................(٣٧)

پاڕانەوەی میوانێکی بەڕۆژوو بۆ خاوەن ماڵ ......................(٣٩)

هەرکەسێك سەردانی نەخۆش بکات ..........................(٤٠)

هەرکەسێك قسەی خێر بکات لەسەر نەخۆش ......................(٤٢)

هەرکەسێك خەڵك فێری کاری خەیرو باش بکات ....................(٤٣)

هەرکەسێك تۆبە بکات‌و بگەڕێتەوە بۆلای خوا ....................(٤٤)

دوعاو پاڕانەوەی مەلائیکەتەکان بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) ...........(٥٠)

**باسی دووەم** ..............................(٥٣)
هەرکەسێك جوێن بە هاوەڵەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) .......... ...(٥٤)
هەرکەسێك لە مەدینە تاوانو بیدعە ئەنجام بدات ..........................(٥٥)
هەرکەسێك خەڵکی مەدینە بترسێنێتو ستەمیان لێ بکات..............(٥٦)
هەرکەسێك ناوو ڕەچەڵەکی خۆی بداتە پاڵ جگە لە باوکی..............(٥٨)
هەرکەسێك پەیمانو بەڵێن بشکێنێت ................................(٦٠)
هەرکەسێك لە خێرو بەخشینیماڵیدا چروكو ڕەزیل بێت ...............(٦١)
ئەو سێ جۆرە کەسەی کە جبریل دوعای لێکردوون ...................(٦٣)
هەرکەسێك بە چەك یان بە ئاسن ئامارە بۆ موسڵمانێك بکات ..........(٦٧)
هەرکەسێك ببێتە بەربەست لە نێوان خاوەنی کوژراوێكو ............... (٦٩)
ئەو ئافرەتەی جێگای پیاوەکەی جێدەهێڵێت ..........................(٧٠)
هەرکەسێك بێ باوەڕبێتو بەوشێوەیەش بمرێت.......................... (٧١)
هەرکەسێك لە پاش باوەڕهێنان بێ باوەڕببێتەوە .................... (٧٢)
دوو ئامۆژگاری ........................................... (٧٤)
ناوەڕۆك ...............................................(٧٥)